## ٢١٢- ئەگەر بۆ خەڵکتە

وەختی دەسچۆنو نەچۆن، یەکرەنْ بـە، نـەک دەسـتت نـەچـۆ
نـــانی گـــەنمـــێن بێـــتو دەس بـــا بـــۆت ببێتـــە تاڵـــە گـــاڵ
مـەکتـەبـی خـۆت پـێ حـەقـە، رێـکو ڕەوان بێرایـە بـەیـن
با لەسەر حەق تێـک بچـێ لێـت عـەیـشو نـۆشو حـاڵو بـاڵ
بێـــرە مـــەیـــدان ڕاسو پـــاک، باســـت بکـــە ئـــازاو نـــەتـــرس
خۆشـــە بـــۆ خێـــری گـــەلـــێ ژێنـــی تـــەنـــێ بـــێ تـــەنْـــگو تـــاڵ
٦٧/١٢/١٠

---

## ٢١٣- چۆن شەرم ناکەیْ؟!

لەلای یـاریْ شـەرمـت لـە کـاریْ هـەیـە      کە پێ خۆش نەبێ، هەرچەنیش گەن نەبـێ
لە بـەرچـاوی خـواوە، چلـۆن هـەڵپـەتـە      لە چشتێ کە بۆت کەسنو، وەیشۆمە بێ؟!
٦٧/١٢/١٧

---

## ٢١٤- دڵت دێ؟

کەسێکت خۆش بوێ پێت خۆشە ژێنـت      وەها بێ هاتوچۆت لـێ دۆر نـەوێتـەو
دڵـت یـێ وا بژێـت، ژێنـی هـەمێـشەت      لە پێغەمبەر بە جاریْ دۆر کـەوێتـەو؟
٦٧/١٢/١٧

---

## ٢١٥- خاسیْ زیادْ بگا، قەدری نازانی؟!

دیــــاریْ دۆســــێ بگاتـــە دەســــتت      ڕێـــزی لـــێ ئـــەگـــریْ هـــەرتـــا بتـــوانیْ
لە نیعمەتی خوا چۆن سوک ئەنـەویْ؟      زۆرە پـــەوکـــانێ قـــەدری نـــازانیْ؟!
٦٧/١٢/١٩

---

## ٢١۶- بەشی خەڵکە؛ مەیرێژە

نایەڵێ نەختێ وەفیڕۆ دەرچێ        بەش خوەشەوێسێ بزانێ کەمە

هەرچێ نیعمەتت لە دەسڕەسایە        زیاتر لە بەشێ بەشی عالەمە

خۆ وڵاتی خۆت پڕیە لە برسێ        جا بەنیعمەت خوا چۆن ئەکەێ گەمە؟!

٦٧/١٢/١٩

---

## دوارەکی ٢١۶- چۆن سەرت دێتە خوار؟

ها ئەو هەسارە دۆرە ترۆسکەیکی تێ وە حاڵ!

نەفست لە کێو چەلێیە چەلێ کەوتە دەورە غار؟

دەێ عەرزو هەرکە، هەرچێ کەلێس، هێچ و پۆچترن

چۆن بۆ کەسێ چتێکی سەرت سوکێ دێتە خوار؟

٦٧/١٢/٢٦

---

## ٢١٧- گیانی «وەسیەتنامە»

ڕۆڵەی ئازێزم خوەشەوێس وەک چاو!        ئومێدی دڵم بۆ خەڵکی داماو!

بڕێ تێفکرە لە حاڵو باڵت        لە دەمو دەزگات، سفرەت، سێپاڵت

بزا: ژیانت: لە تەک ڕێگایێ        کەوتۆیە سەری، ئەچن بۆ لایێ؟

ئەگەر پڕ بە دڵ لە تەک تێگەیێن        کەوتویە سەر ڕێ ڕابەرانی دێن،

بە بەر زەڕەبێن هەناو هەناوت        وەک تەمێس کردن دڵو هەناوت

بەڵام وریا بێ: نەفسی نەگبەتپێژ        فامت کول نەکا لە سرنجێ تێژ

یا: ـ خوا نەکەردە ـ سوار بێ لەسەرۆ:        عەقڵت گزێر بێ بۆ پێنەو پەڕۆ

کەسیتر ئاسان بکەێ تاوانبار        لە عەیبی خۆ دێن، «دڵ»ت بێ بێزار

تاڵە وەدڵ خۆ: تاوانبر کردن        تاڵترە: کاتی گیانەڵاو مردن

بــرات، هــەرچــەنــیش نالایقــەو گــەن
چەن چتێکت لــێ ئــەپرسـم، تــۆ خــۆت
حەز ئەکەێ: هاورێ، هاو هێوا، یا کەی
وابــۆ چــوار ڕۆژی عــومری دنیایــان
وا بۆ ماقوڵێو دەســەڵــات، هــەرچــەن
وابـــۆ کـــەیفێکـــی دنیـــا، هـــەزاران
وابــۆ دەســەڵــات، کـەلـەپچـەو پـاوەن
وا چــە نــاکۆکێو کــەســنو ناپــاکێ
ئــەوانــە واکــەێ، بــۆ تــەنیــا تــاوێ
ئەوانـە واکـەی، «هــەوا»یـان، خوایـە؟
وا لــە ئێمــانێ بــەڕاس بــێبــەشــن،

لەبەر عومری زۆر، تەجرەبێوەش هەن
وەڵامیان، بێ گەڕ، پەیاکـە بـۆ خـۆت:
هاورەنْ بڕێ بـێ لـە ئێمـان بـەگـەی؟
تــەواوی بــەشــەر هێچــە لــە لایــان؟
ناحەساو بۆیان دەس بـدا ئـەیکـەن؟
مەینەت ئەڕژێنن لـەسـەر هـەژاران؟
کێ «بۆ؟»یێ بێژێ لە پاو دەسی ئەکـەن؟
لــە نــاو خــەڵکایــە، لــەوانــە پــاکی؟
دائەنـێن عـومرێ هـەر تـەواو نـاوێ؟
ئــەو پــەڕ دێمــەنیــان تــەنیــا دنیایــە؟
هەرچەنیش گوایە لـە ئێمـان گـەشـن؟

—

هاوڕێگەو هاورەنْ نەبۆن یا کەی بۆن
گران پەی بـردن بـە ڕازگـەل هێـواس
جا ئەر نەتتـوانی ڕێ بـەێتـە نـاو داو
ئـەتـوانێ بـە تـێن وردێ فـامو هـۆش
ئامـــانجی ونبـــۆ وە بـــێ ئـــەمانـــە
چۆنکە خۆی لە بەر خوێنتاڵێو گـەنـێ
ناچـــار هێواگـــەل کـــەم نابـــارییێنێ
دەسەی دزدەسەک بێحـەسـاو زۆرن
ئــەم چــەن نمۆنــە مــەینــەتبــارترن
١- دڵـــت ڕازیـــە: تـــازە منـــاڵێ
دڵــی چکوڵــەی بــۆ چتێکــی جــوان
تۆ پۆڵ ئەو چتـەی بـە زۆر لـێسـێنی
دایکـەێ بـۆ شـاێان بیـەێتـە بـەرپـەڵ

ئەتوانێ ئاسـان لـە خـۆت بکـەێ ڕۆن
کاتێ بە حەو ڕەنْ، خوەی ئەکا نانـاس
هێـواو ئـاواتی خـۆ لـە حـەشـار داو
پەی بەێ بە بڕێ هێوای کەم ڕۆپۆش
ســەختــە کانگــای دڵ بکاتــە یانــە
گمــە تــەنانــەت لــە لای خــاوەنــی
ڕچەی ڕێگەی خۆی بەوان ئەشکێنێ.
لە گەنێو وتێش یەکجار جـۆر جـۆرن
بۆ سەر کەردەی شەڕ خزمەتکارترن:
وەک خونچەی بێئاو بـێڕەنْو کـاڵێ،
یا خـۆش، بفرێـتو، کـەوێتـە گریـان،
تــا هــەوەسـێکی خــۆت وەجــێ بێنــێ:
وە جگـەرەی بـەێ بێکـەێتـە دۆکـەڵ؟

—

٢- ڕازێت: کورپەیی، لە نازو نیعمەت — بێبەش، لە ماڵێ ژاکاوی مەینەت،
لە بێپۆشەنیێو برسیەتیێ، زۆسان — کایەی ببێتە لەرزێنو گریان،
تا تۆ سفرەت پڕ، پۆشەنت جوان بێ — «ماقۆڵانە» بێ بگاتە بەرپێ؟

—

٣- دڵت هەر ئەگرێ کە: تازەلاوێ — بەنەنو خۆشێ دڵ دایکو باوێ،
نەخۆش بێ، باوکو دایەی هەژاری — ماتڵ بن بۆ خەرج حەکێمو شاری،
هەرچەن تەقالاو ماڵەو ماڵ بکەن — لە هیچکوێ دەسیان لە هێچ نەبێ بەن،
تازە لاو بمرێ لە بێدەرمانێ — بەربێتە دڵی دایکو باب ژانی،
بەشکە تۆ سفرەت بۆ خۆ نوانن — یا نە: خۆشێو داخ دڵ دۆسو دژمن،
نەختێ جوانتر بێ، لە خۆراک پڕ بێ — یا خواردەمەنێت پڕ تێنو گوڕ بێ؟[1]

—

٤- دڵت هەڵئەگرێ: چەن ماڵە هەژار — دێواریان، چلەی زۆسان بێتە خوار،
درشتو وردی خێزان، برسێو شڕ — بلەرزن لەناو ماڵێ ساردو سڕ،
تا تۆ بتوانێ: وەک خاوەن پۆڵان — ماڵت شان بدا لە ماڵ «ماقۆڵان»؟

—

٥- ڕازێت: مالکێ بێهەوڵو زەحمەت — بۆشناخو ماقۆڵ لە ڕەنجی ڕایەت،
جۆتیارێ خەرمان بارانگر، لە کار — بکاو؛ بۆ کار خوەی، بێباتە بێگار؟
یا: ڕەشاییێ بێزەوێو ماڵات — بێ کار، ژێواری ڕۆژێ شک نابات،
لە نوخشەی کارا، گەلی ئەرباوێ — بێخا لە هەولێ بۆ نانو ئاوی؟
بێتۆ داماوێ بێژێ: ئاغە گیان! — بە سەر خوەت دوڵەم خاڵیە لە نان،
ڕەحمێ بفەرمۆ بە وەزعو حاڵم — بە زکێ برسێ ماڵو منالم،
بە مشتو لەقەو بە جنێوباران، — بەربێتە گیانی بێبێزنێ لە گیان؟

—

ڕازێت: وە مەینەت ڕایەتگەل داماو — بگرێو بگەڕێ سەر تەنۆر ئەرباو،

١ ـ توضیحاتی دربارەی ١) ضرر باور به بعضی برنامەهای «تغذیه» ٢) قول بوعلی ٣) ماجرای رمضان دفترخانه ۴) واقعیّت زندگی اکثر زحمتکشان، و قهرمانانی مانند عمر و علی ـ ع ـ و رهبر و مربی بزرگوارشان ـ ص ـ ۵) اصل مسئله چیست؟

دۆکەڵ کەواوو، پڵاو گەورە ماڵ    پڕ کا ماڵانی خاڵیٚ لە نان گاڵ،
منالگەل برسیٚ لە سامی ئەرباو    هەر لە دۆرەوە بکەن بۆی کەواو؟

—

٦- ڕازێت: خزمەتکار لە کوڵیاگو کاڵ    داچنیٚ لەسەر سفرەی خاوەن ماڵ،
لەبەر چاویەوە خوەراک ڕەنْاوڕەنْ    بخوریی، ئەویش، خەمبارو بێڕەنْ،
بچێتەو برسیٚو مانۆ بۆ ماڵی    تامازرۆ وەک ژنو منالی
کەیوانۆ بۆ ژەم نانو دۆ بێنیٚ    یا ئەو پەڕەکەی: چێشتە کوڵێنیٚ؟
ئەگەر جارجاریش ئەمێنێتەوە    سەور کا تا سفرە جەم ئەبێتەوە،
بخوا پاشخوانە سەردو ناتەواو    چە هێشتا گڕی، بەربێتە هەناو؛
خۆ ئێسە ژنو منالی، لە ماڵ    ناتوانن تێر بن لە نانو دۆی کاڵ،
لەولایش منالی مالی خەم پڕژێن    هەر لە خەیالی گەورەیان بدوێن:
یەک ئێژیٚ: شێوی بابام پڵاوە،    ئەم: نە، ئاو گۆشتە، ئەو: فڕۆجاوە،
دایەی خەم لە دڵ لە ژیانی تاڵ    بۆ ڕەوێنی خەم لە دڵی منال،
ئێژیٚ: گیانەکان! ئەمانە قسەن    گەورەماڵیش هەر نانو دۆشا هەن.
هەزار نمۆنەی ئاواو ئاواتر    لە دڵت داخۆ بەرنادا ئاگر؟

—

٧- دڵت ڕازیە: کاورای خاوەن کار    تا بەردەسی، نایٚ هەنْاوێکی لار،
لیٚ بوارێنیٚ زێلەو شەپاڵە    چە ناونێتکەیەو چە قسەی تاڵە،
بەردەسی داماو جاریٚ نەوێریٚ    جواویٚ باتەوە، سەریٚ هەڵبێریٚ؟

—

٨- دڵت ڕازیە: سەرگەورەی دەمهار    کە ناکا نێوەی پێشخزمەتیٚ کار،
قول لە سەر قولو دەعیە زل ناحەق    ژێردەسەی سوک کا بەقسەی لەقلەق؟

—

ئایا ڕازێت بەو گ ناحەساوە    کە لە ناو خەڵکا لە گلا باوە؟
ئایا پێت خۆشە: نەزمی بانو خوار،    ماقوڵو ملکز، دەسپڕو نەدار؟
وەک واتەی قورئان: ملەت، تاق تاقی    «مستکبر» بنو «مترف» بن، باقیٚ،
«مستضعف» بن، تا ئەو نەزمە پێسە    بکێشیٚ تاناو خێزان وەک ئێسە؟

کـەیفـت نـایگریٚ: قـانوٚنی قورعـان: بەشەر وەکیەک بن: هاوحەق‌و هاوشان؟
نـەزمـیٚ بـە قـانوٚن «فطـرت»، وا بـاوە بـەسـەو، قـانوٚن دیٚـن بچیٚتـە لاوە؟
یانیٚ: بەشەریش هەر نەزمی «تکـوێن» بەڕیٚوە بـەریٚ، وەبـیٚ نـەزمـی دیٚـن؟
یانیٚ: لە بـەیتـی شـیعریٚ، هـەر لایـیٚ! یـانیٚ: ڕیٚ بـڕوا بـەشـەر بـە پـاییٚ!
یـانیٚ: پـەلـەوەر بـە بـالیٚ بفـڕیٚ! ئـاوردوٚ وە بـیٚ ئـاگردان بگـڕیٚ!
ئـەریٚ قـانوٚنی دیٚنـیش بـیٚ قـەبـوٚلیٚ، وەها بیٚ، توٚ هەر کوٚک بیٚت‌و مـاقوٚلیٚ؟

— —

گیانـە گـەرەکتـە: پلـەت بزانـیٚ لـە موسـولٚمانیٚ‌و ناموسـولٚمانیٚ؟
بزانـە: دلٚـت وەلٚـامی چیـە؟ چـەن ڕازیٚ، بیٚـواز، یـا ناڕازیـە؟
کولٚوٚلیٚ، کەیف ئەکا بەو وەزعە کە هەس یـا دلٚـی ئیٚـژیٚ: بـە تـٚوٚن‌و تـەوەس.
چوٚن، «بان بوٚن» بوٚ خوەی ئەکا ئارەزوٚ هەرچەن نـەیـشزانیٚ یـا نـەیخاتـە ڕوٚ
ڕیٚخـیٚ لـە نـاوی کلٚاشـی خوٚیـە وا ڕازیـە بـەو زلٚمـە بیٚـشوٚیە
ئەگەر «خوٚشبەختی» «نـە»یـە وەلٚامـت «نـە»یـیٚ کـار بکـا لـە دلٚو فامـت
«نـە»یـیٚ، قـەبـوٚلی «فطهـّـر» بـەوە لـە ڕەنٚ «اسـتکبار» بـت‌شـوٚریٚتەوە
«نە»یـیٚ هـەلٚسیٚنیٚ لـە دلٚـت بـوٚ سـوٚ خویٚنتالٚ کا ژیٚنـی وەبیٚخـوٚی بـوٚ خـوٚ
«نـە»یـیٚ بتکاتـە هاوڕیـەی پاکـان صـوٚزیٚ ببیٚتـە هاومـەنـزلٚ چاکـان
«نە»یـیٚ لە زوٚری تەکـان بـەیتـە خـوٚت لە دژ «طبقات» هەرچـەن بکـریٚ بـوٚت
«نـە»یـیٚ حالٚیٚـت کـا ئالـەو دەردانـە لـە دیٚمـەن دنیـا چـەنـیٚ ناجوانـە
چـەن دەوروبـەرت سـنوٚر تـا سـنوٚر خویٚنتـالٚی فـەرقـە لـە نزیٚـک تـا دوٚر
وابیٚتـە مـەیـدان، بـە حـەسـاوی دیٚـن ببیـە گیـان‌دانـەر بـوٚ «مستـضعفین»
«نە»ت وا «نە»یـیٚ بیٚ ئیٚتر پیٚت‌نـەکـریٚ «مـدّثّر» بیٚـت و بخزیٚتـە نـاو جـیٚ
«نـە»یـیٚ بـیٚ ڕوٚژی «یقـوم الأشـهاد» وەک ئازاگەل بـیٚ سـەربـەرزو ئـازاد
دیـەت ڕوٚشـن کـا بـە دیـار خاسـان بـەشـکە زوٚتـریش خـوا بیٚکـا ئاسـان
ئەی هەزار دەم‌و دەزگاو تـەورو تیٚـز فـدای تـاویٚکی دیـاری ئـازیٚز

— —

گیانـەکـەی کاکـەی! تیٚفکـرە: بـرات بوٚ لەم بـارەوە ئـەوٚنـە بـاس ئـەکـات

ئاخر دێنی خوا خۆ بۆ ئەوە هات
ـ «دێنی خوا» ئێژم، نەک ئایێنی باو
چۆنکە تا پەتای «طبقات» مابێ
سرنجەی بدە «کتابو سنّت»
یانێ «لا»ی تەوحید تا «ن»ی قانۆن
گشتی، بۆ بەشەر، بۆ وەک یەک بۆنە
گشتی، ماقۆڵو خۆشگوزەرانان
«لا»ی تەوحیدشێوان ڕێوڕای ئەوانە
«قانۆن»یش هەروەک «مەبەس رسالت»
تا مەردم ببن: هاوڕەنو هاوشان

بەشەر ڕزگار کا لە شەڕ «طبقات»
«جاهیلیّەتی» پۆسی دێن پۆشاو ـ
کۆمەڵی تەواو ئیسلامێ نابێ
هەر لە بنەڕەت هەرتا ڕواڵەت،
هەر شەڕە لە گەل لە گەل بانتر بۆن
بۆ خاوێن بونی دەرو دەرۆنە
دائەنێ وەناو دژمنی انسان
«ئەخلاق» بۆ تێکدان یاسای ئەوانە
بۆ دامەزرانی «قسط»ەو عەداڵەت
بێ «استکبار»و «اتراف» بێ انسان

—

جا تۆ ئەزانێ بە «وەها شەڕێ»
ڕاسە: ئەکریێ وەبێ گەرۆ زۆر
وەلێ وەختێ تۆ ڕێڕەوی دێنی
(بۆ قانۆنی «قسط» ئەر تۆ نەکەێ کار
وەختێ بە تەنیا «حەدی ناوەڕاس
تۆ بۆ لەوە بان ئەمانەتداری
بە پای حەدێسو ئایەی بێ ئەژمار
هەرچەنێ زیاتر خەرج ئەکەێ، هەرچێ
بە گیانت، بەش ئەو مەزلۆمانەس وا
یانێ: گرانێ ماڵت، ناو ماڵت
لەو گشتە خەڵکە تاڵان کریاگە
پێت خۆش بێ یا نە، لەو هەزارانە
حەزرەتی صادق، بە «سەرانەی ساڵ»
یانێ وە تەخمێن، چوار هەزار درهەم
لەوەلای، پێبەش هەژار خواردن بۆ

ئێتر لە بڕو بیانۆ گەڕێ
«باو» دەوڵەمەنێ بۆت کردبێ جۆر،
باوی لا لە دێن ڕجوا ناوێنی
کێ هەوڵ با؟ «زاڵم»؟ نەزانی هەژار؟)
بۆ هەرکەس»، قسطو عەداڵەت بەرپاس،
زیادڕەوێ کەێ، خەیانەتکاری
لە حەد «سەرانەی بە حەساو ئامار»،
بێژێ، ناڕازێم انسانێ کز بێ،
نمۆنەیێکمان لە هەزار هەڵدا
ماشێنت، پاڵات، سفرەت، سێپاڵت
دابڕ کریاگەو بە تۆ دریاگە
ژێوارت، ڕادەی، لە «أوسط» بانە
تا چوار هەزاری دانا بە حەڵاڵ
بۆ هەرکەس، خەرجی ئەوساڵەو، سەرهەم
خەیانەت وە ماڵ هەتێو کردن بۆ

«شــرّ أمّتـي الأغنيـاء» یـانیٚ:
جا خەرجی کا تا وە ئیسراف ئەگا:
خەرجی «مصرف» یا شتی عەلەنیٚ
ئەوسا حەساوە لە جەم «مترفێن»
دەنا هەرچەنی، دراو بۆ لا بیٚ
(ئەڵبەت ئەزانیٚ: قسطو ناوەڕاس
مەبەسە: دابێن ئەنازەی نیاز
هەرچێکی دەسکەوت، وەهیٚ خۆی دانیٚ
بگارە لە حەد ناوەڕاس بدا
یا: هەر بێکاتە پاشەکەوتەنیٚ
ـ بەقسەی قورئان: وەیشۆمەی زەوێن ـ
ئەر بۆ خۆی نەبیٚ، دەوڵەمەن نابیٚ
بڕیٚ جار لە ڕێز «مساوات» جیاس
وەک: بۆ گەورەو ورد، یا خۆش و ناساز)

—

پاشان، ئەزانی: بۆ خەڵکی عادیٚ
وەلیٚ تۆیێ ـ لێت پیرۆزبیٚ ـ توانێت
ئەشیٚ: «همّتو غیرتت» وابیٚ
هەر تەنیا ژێنی وەک چێنی هەژار
فەرمۆدەی «علی»ت بێستوە بۆ ژێن
(ئەڵبەت نەک تەنیا بۆ دڵی هەژار
وا ژیان فایەی، زۆرە، وەلێکان
ئافرەتی؟ وە شون «خدیجە» کەوە
چۆن لە تەک چاوی دڵی کریاوە
چە ماڵو پۆڵ بۆ، وازی لیٚ هاتێن
زۆر ئەبۆ چەن ژەم ماتڵ ئەمان بۆ
پیاوی؟ «ابوبکر»ی خوێنشێرێن
بزانە: یاری نمۆنەی ئێمان
بەڕاس دێمەنی «صدّیق»ی «أتقی»
لە ماڵی خۆیا چیٚ شک نەئەبرد
بەجێس مەلایکە لیٚ مات بمێنن
تا ئەو ڕادەیە هەیە ئازادیٚ
پا لە جیە پای «پێشڕەوان» دانێت،
چە دنیاس لەلات وەک دەنکیٚ کا بیٚ
ڕجوا بوینیٚ بۆ خۆت‌و، قوتار
ئەوانە واکەی پێشڕەون بۆ دێن
با: خۆیشت، بە کار هاتۆ، بێتە بار
«هەر بۆ دڵ هەژار» بەسە بۆ چێکان)
بەڕاس ژنیٚ پیٚ بێژن: «ژن»، ئەوە
ئەشرافیەتی، هەمۆ نا لاوە
بۆ نەجات خەڵکو سەرکەوتنی دێن
دۆ دەنک خورما یا خەپلەییٚ جۆ
بکە سەرمەشقی پیاوانە ژێن
چۆن چە ماڵی بۆ لیٚگەڕا ئاسان
کە پاش ئەو وەزعو ئەو دەمو دەزگا،
وە شەڕەی مەردم دەڵاڵیٚ ئەکرد،
بۆ «انسان» سەری سوجدە خەوێنن

—

مەیژە کە وابۆ، ئەی «لاتبسطها»؟
ڕیٚو شوێنێکی هەس هەر حوکمێکی خوا

قانۆنی ئیسلام کرو کپ نیە
وەک دەزگای «خلقت»، اجتهادیە
هەر بە حوکمی خوا وا هەڵئەکەوێ
واجب، وە گوناە؛ حەرام، فەرز ئەوێ
خەتەرێ لەڕێ کەسێ، نوێژت، یام
تێکەی بۆ دەمت لێ ئەکا حەرام
جا ئەر بۆ کەسێ وە عادێت زانێ
قانۆنێکی وا گچکەس مەیدانی،
هەرووەک ئەزانێ: بە گوێرەی امکان
بۆ «بان»، گەورەتر ئەوێتەو مەیدان
بۆ ئۆمەتێکی تازەی گرفتار
لە هەر قانۆنێ، پێشترە: «ایثار»
بۆ ئەبۆبەکر، «بلال» نەجاتدان
لە ژێر شکەنجەی دنیاپەرەستان،
گەلێ بانترە لەوە بزانێ:
داخوم لە دوڵە ئەمێنێ نانێ؟

—

جا بۆ منو توێش ڕوڵەم ئاسانە
کەوێنە سەر ڕێ ئەو ڕێبەرانە
ئاخر خۆ جاوجوڵ یا پۆڵو پارە
لە بەرچاو بۆچک، گەورە دیارە
شاعیر وتەنێ: بۆ بچۆک، بچۆک
گەورەس؛ بۆ گەورە، گەورە، وردەو سۆک
کەسێ بە پلەی «پێشڕەوێ» بگات
تازە ناگێرێ لە بۆ ئاونەوات

—

جا زیاد لە نەکبەت خۆشگوزەرانێ
دەردی «دەمار» چۆن وە سوک ئەزانێ!؟
بە گیانت گیانە دەزگاو مێزانت
پۆشەنی جوانت وەک سفرەو خوانت،
گشتی، نیشانەن: گێروەی دەعیەی
تێفکرێ، خوێشت ئەتوانێ تێگەی
(چۆنکە فێز، شێوەی، زۆرە، بڕێکان
ناسێنی، سەختەو؛ بڕێتر، ئاسان).
ئێژێ توانێوتە لە دەعیە لادەی؟
ئەیبۆ خۆت هاوڕەن هەژاران ناکەی؟
سفرەت بێژێن «هەر لە چڵێسیە»
ئەی بۆ باقێتر، تەئویڵت چیە؟
ژێرانەترێن تەئویڵت، ڕەنگە
ئەوە بێ بێژێ: «هەژارێ، نەنگە»:
«ئەر مەردم، کەسێ، نەدار بوێن
قسەی حەقیشی، بەلاش ناسێنن»،
«نوێنگەی واتەی «کەوا نان بخوە»ن
بە«ماڵ» ڕێزگرتن، کەمو زیاد ئەکەن».
بەڵێ، وان خەڵکی ونی دنیا بۆ
وڵاتی خوێشمان، جاران هەروا بۆ
وەلێ گیانەکەم ئیتر ئێساکە
بەرچاوی عەقڵی فرە کەس پاکە
ئەر خوەیچیان نەبن بەسەر نەفسا زاڵ
لایکەم، ئەزانن: فەرقی کاڵ تا قاڵ

به هەر جۆرێ بۆ، شوکری خوا ئەلعان ... یەکجار غەرێب تێن، وەک جاری جاران
ئێتــر وانیـــە: کافرمـــان دانـــن ... وەک بــەڵاجــەوێ، بۆمــان بــڕوانن
ئێتــر کــەمڕەنگــە تۆمــەت و بوختــان: ... لامەزهـەب، گـومڕا، بـێدێـن و ئێمـان
ئێتــر کــەمتێنــە ئــەو جــاڕو قــاوە ... ڕێ «مەکتەب قورئان» نەختێ ناسراوە
ئێتــر نایــەوێ: بــۆ چــاوی ئۆمــەت ... هاوڕەنْ «باو» بێت و سازکەیْ ڕۆواڵەت
ئــەگــەر بـزانن: لـەســەر ئــەو ڕێگــەیْ ... ئێتر گوێ نـادەن: شـڕی یـا پۆشـتەیْ
ئــەگــەر کـەسێکیش ناسێتی و، زانـیْ: ... توانێوتــە بــۆ خــوا خۆشــیْ وەلا نــیْ،
ئێتــر ئــەزانـــێ: دڵــسۆزی گــەلـــی ... وەک: سۆک نـاوێنێ عومـەرو عـەلـیْ

—

جا ئەگەر توانێت چش کـەی لـە دنیـا ... بــارگێنی دڵــت لــە گــڵ هــەڵکنیــا،
ئــەمجــارە ئێتــر بــەڕاس ئــەتــوانیْ: ... «سابق» بیْ لەسـەر ڕێ موسـوڵمانیْ.

—

ئــاخر ئێسە چش لـە کـەم نـەتـوانیْ ... صــۆزیْ بــۆ فــرە چلــۆن ئــەتــوانیْ
نەفس ئەگـەر ئێسە وە قسەت نـەکـا ... زۆری بۆ، بۆ زۆر، گوێت بۆ شل ئەکا؟

—

مـەخڵـەتـە بـەوە بێـژن بـە غـەڵـەت ... مـەعنـای حـەدێـسی «آثـاری نعمـت»
بزانـــە: «مفهـــوم مخـــالف» چیـــە؟ ... کامـــەیـــە وا خـــوا پـــێ ناڕازیـــە؟
ئـــەوە، ڕژدیـــە لـــە خـــۆو خێـــزان ... کـــەنـــسیْ لـــە تـــەک ئـــاوەڵو مێـــوان
«ڕژدیْ» وا پێسە، کـە خـەرجـی فـرە ... لـــە حـــەســـاو دێنـــا فـــرە خاســـترە
چ تــەفـسێرێ وەک ڕەفتـار پێغـەمـەر ... مەعنای حەدیثمـان بـۆ ئـەخاتـە دەر؟
کراسـی هـەزار پێنـەی عومـەر گیـان ... بۆ «ردّی شـبهه»س باشـترێن بـەیـان
نـە، گیانـە مـەبـەس بـەوە مـەزانـە: ... خـۆ بڕازنێتـەو لـەلای خـوا جوانـە
سـادە ژیانـت، بـەو شـەرتـە بـە پـای ... «مـەسئۆلیەت» بـێ، جـوانترە لـەلای
پۆڵ بـەدەس بێنـە بـە شـێوەیـێ پـاک ... وەک چاکان بێکە خەرجی کاری چاک[1]

---

١ – نعم المال الصّالح للرّجل الصّالح!

ئەوەی لە زەرقو بەرقی خەرج ئەکەیْ باشە بۆ خزمەت وە مەردمی بەیْ
مەسەلەن: بە پۆلْ فەرشێکی گران لە مالْ چەن هەژار گەرم کەیْ جسان
بە پۆلّی خەرجی چەن مانْیْ دۆکەلْ پۆشتە کەیتەوە کۆرپەییْ ڕۆتەلْ
بە چتیْ ژیان بیٚئەوەیش ئەویْ خێزانیْ وەسەر ڕیْ ژیان کەویْ
ئاواس دیاربۆن ئاساری نیعمەت نەک نەفسو شەیتان ڕازیْکەی لە خوەت
(کەم کەس هەس وەها خۆی بگەیێنیْ: کاری بۆ دنیا بۆ خواجیْ بێنیْ)
وەک تەکلیٖف، نسبیْس ناحەزیْو جوانیْ خۆ «حسنات الأبرار» ئەزانیْ
ئەگەر لە ڕژدیْ، هەلّڕشتن، جوانە بۆ تۆ گاولّکیْ لە شان شەیتانە.
خۆ خۆشە جوانو بۆشناخ بیْ کۆمەلْ بەلّام نەک بڕیْو، باقیْتر ڕۆتەلْ
کۆمەلّیش وەک یەک خێزان بزانە: وا، لەویش، شتیْ، ناحەز یا جوانە[1]
وا جوانە: بە پیْ ئەنازی دەسهات گش وەک یەک بژیٖن مەردمی ولّات

—

وەلیْ تا سکەی «بانو خوار» ڕەواس بۆ تۆ نارەواس ڕادەی ناوەڕاس
بیٖستمان لە عەلیْ زانای خوێنشیٖرین شێوەی ژیانی پێشڕەوانی دیٖن

—

لە گشتیْ گەڕیٖن، گیانەْ لە لای دلْ[2]، لە بەرچاو کۆرپەی بۆ گشتیْ ماتلْ،
لای خواو ڕەسوْلْو مەلایکەو خاسان پێت خۆشە: لە تەک زالّم بیْ هاوشان؟
پێت خۆشە: شێوەی ژیانت، بارەو پێغەمبەر بیْ یا «قیصر»و «خسرو»؟

—

«زینتکم» و «کلوا و اشربوا» بۆ هەر سێکیانە: «و لا تسرفوا»
مەعنای «اسراف»یش، لێت مەعلۆمە خۆ فەرقی، چەن زۆرە لە مەردم تا تۆ[3]

— —

١ – لە شیعری ٢٣٥ وردبنەوە.
٢ – نەک نەفس. مەسەلەی: ١) لیْشێویانی خواستی هەر کام لە سیْ دەزگای دەرۆن، ٢) کارکردنی هەر کام لەوانە، لە ئەوانیترا، ٣) کارکردنی بڕیْ لە هێزگەل یەکیْ، لە هێزەکانیتریا، یا لە بڕیْ هێزی ئەوانیترا، باسێکی زۆر وردو کەوشەنداره. انشاءالله فرسەتی بڕیْ لیْدوانی، دەس بدا (یەکی مانْگی ڕەمەزان بە ئاسۆی تاران، ١۴١٠).
٣ – تماشای ژمارەی ٨٣ کە.

بەڵام وریا بێ: نەفسی تەشقەڵباز     بەم ڕێگە داوت لە بۆ نەکا ساز:
مەبەستت بێ: خۆ بکەی خوێنشێرێن.     ئەم ڕا لە دەس دەی: هەمدنیا هەمدێن.
دڵ تەنیا لە تەک خوا بێ مامەڵەی،     شێوەو تەقالات، پڕ بەرەو بێوەی[1]

مەبەستیتریش، پێوێستە ئاگات     لێ بێ، تا کارت لە ڕێ لا نەدات،
ناسێن چۆنیەتی تەکلیفەو، شێوەی،     هەرکەس بە گوێرەی مەسئولیەت خوەی
مەسەلەن: ئەر هەی خاوەن ژنو ماڵ،     نابێ لە خێزان، ژیان بکەی تاڵ
ئەبێ تا بەینێ، لە ژێنی جۆرجۆر،     لە خاسو خراو، خاوەن کەمو زۆر،
بە شێوەی «حکمت» بۆیان بکەی باس     تا شەوق پەیا کەن بەرەو باری خاس
ئەر نە «قەناعەت» ئەبێتە نەگبەت     وەک بێستت باسی «ئاساری نیعمەت».
ئەر منال مالی، لەو تەکلیفانە،     حورمەت دایکو باوک، بانتر بزانە
ناوی بێکەیتە لەنجو لەنجبازی     تا لە خوەتو ڕێت بەن نارازی
تەنانەت: ئەگەر بۆ لادان لە دێن     زۆرت بۆ بێرن، هەر گەرمو بە تێن،
خزمەتیان بکەی بە ئەدەبو فام     لیان کەم نەکەی ڕێزو احترام
وا، وردە وردەو ژێرانە لە سەر     مەبەستت بچۆ، ڕێگەت بگرە بەر،
ئا ئەگەر بە دڵ هاوڕای ڕێت نەبن     لای کەم لەڕۆتا لە سەری نەچن
باقی خێزانیش هەرکام لە جێ خوەی     ڕێزو محبّت بەجێ بێنە بوەی
وا، وە دەسۆر دێن بپێوە ڕێگەت     بەشکە بۆ وانیش بوێتە ڕەحمەت
بەم جۆرە، دێریش خو بگەیێنێ[2]     هەر خاستر ڕەزای خوا وەدەس بێنێ

کەسم! ئەزانی: چەن قەرنە بە ناو     دێنی خوا چەنی ئەکری ناحەساو!
چەنی زۆردارگەل دڵ دێلی زەوێن،     بێدێنگەل بەناو ڕابەرانی دێن،
خەیانەت ئەکەن بە دێنو مەردم     تا وا مەردم بون لە ڕێ خودا گم:
زۆربەی ئەوانە وا موسوڵمانن     دێن هەر بەوە وا باوە ئەزانن

١ – لە شێعری ١٧٠ لە ئاخرو ئۆخری «جۆری ژمارەی –١–ی ژیان»دا بڕێکیتر لەم باوەتەوە باس کریاگە.
٢ – مەبەست، قاڵو پوختە بۆنە.

یـانیٚ: تـەرمـیٚ سـڕ لـە بـاتیٚ گیـان
لـە بـەر دڵـی پـاک بـەوەیچـە ڕازێـن
ئەزانـن: گیانـدار وە بـیٚ «ئـاو» نـاویٚ

گەنکاویٚ لە جـیٚ سـەرچـاوەی ژیـان
با فـەسـاد پڕتـر نـەکـا سـەر زەوێـن
ئـاو شـک نابـەن بـا ببـیٚ گـەنکـاویٚ

—

بـرِێکیش وەختـیٚ چـاو ئـەگـەڕێـنن
بـاوڕ ئـەکـەنو، لـە لایـان وایـە
پیـان وایـە: دێـن، بـەڕاس ڕازیـە
نەخسوٚس ئەوێـنن: کـەسـانیٚ ناکـەس
خوٚ بە ڕواڵـەت، دێنـدار هـەڵئـەخـەن
خوێنتـاڵتر: بـڕیٚ وردە شـەیـاتێـن
چەو، چوٚن، بلەویٚ بوٚیـان، ناحـەسـاو
ئـەیکـەنو؛ ئـەنجـا بـوٚ پێنـە، هـەزار
جا ئەگەر بە ڕاس، بگـریٚ دڵو هـوٚش
ئەرکەسیٚ بە پـیٚ «سرشـت»ی خـوایێ
لـەو دێنـە لارە، چـوٚن نـابیٚ بێـزار
دێنـی «اخـتلاف» دێنـی «طبقـات»

بـە نـاو دێـن، چـشتیٚ ئـاوا ئـەوێـنن،
«دێن» هەر ئەوەیـە لـە نـاو خـەڵکایـە
بـەم نـەزمـە پیـسە «طبقاتیـە»[1]
لە ماڵی حـەرام تـەیـارو سـەرمـەس،
تـەنانـەت بـوٚ دێـن داکـوٚکیٚ ئـەکـەن،
مایـەی بـەدنـاویٚ ڕابـەرانـی دێـن،
لەوەی خوا چەکی کفر ئەیکا حەسـاو،
ئایـەتو حـەدیـس ئـەخـەنـە قـەتـار.
«ئیسلامی بـاو»و «قـاو»ی دێنفـروٚش،
ببێزنـیٚ لاریٚو لـە «فطـرت» لایـیٚ،
دێنـی هـاوڕەنگـی خـوێنمژو زوٚرکـار
دێنیٚ، دێنی خـوا لـە دژی ئـەو هـات؟

—

لەولایش، ماقوٚڵیٚ پـەرسـتو پوٚڵخـواز
بـەوە وا بـاوە بـە نـاو دێـن، ڕازێـن
هـەرکـە بیـەویٚ بـە نوٚسـێن یـا بـاس
هەزار نـاو نێتکـەی پیـا هـەڵئـەخـەن
تـا ناڕازێگـەل بـەو دێنـە بـاوە
کـە ئـەریٚ کریـا هـاودەس ئـەوان بـن
خولاسە: هەر کەس، دڵـی لای دنیـاس
وای پیٚخوٚشە: خەڵک یا هەر بیٚدێن بن

دژی دێنـی حـەق ئـەیکـەن بانـگـەواز
چوٚنکە خەڵک ئەخـا لـە تـەکـانو تـێن
مـەردم حـاڵیٚ کـا لـە دێنـی بـەڕاس،
نەک خەڵک بە قسەی، تەکانیٚ بخـوەن
بـەڕاس بـزانن ئـەو «بـاو»و «قـاو»ە
دژی «دێن»، دەنا بەرەو «دێن» ئەچـن
لـە تـیٚگـەیێنـی مـەردم، نـاڕەزاس
یا: ئەر دێندار بوٚن، هەروا بیٚتـێن بـن

---

[1] – هەم مەعنەویٚ هەم مادیٚ.

چۆنکه دێنداریٚ له سەر دێنی حەق، خەتەرە: دەزگای ناحەق بکا لەق
دێنیٚ وا خاسە ڕەواجی هەبیٚ بۆ «گورگو ڕێویٚ» زەرەری نەبیٚ

—

حەتمەن توێش هەر ژنەفتگتە، زۆر لە دەم دژمنگەل کۆنەو نۆی جۆرجۆر،
ئێژن: فڵانیٚ لەڕیٚ ڕاس، کەلاس هەر ئەمە واکەی باوە، دێنی خواس(!!)

— —

دەسەگەلتریش، زۆر پەیا ئەون لە ڕاچاندن خەڵک تاویٚ ناسرەون
بەڵام داخەکەم لە بەر زۆری باو لە بریٚ بارەو ناتەواونو خاو.
جا لەم دنیایەی لێوان لە پەستیٚ لە «باوڕ»و «خوٚ»ی مادّەپەرەستیٚ،
کە بوٚ فرەییٚ، هەروا ئەوێنیٚ: سەختە قەبۆڵی ئەخلاقی دێنیٚ،
ئەوانیش بۆ دێن، هەر بیٚزەرەر نێن، هەرچەنیش بە دڵ تێکۆشن بوٚ دێن.
فرە هەن، عەیبیٚ، لەوان بوێنن وە ناو ئیسلامی، وە حەساو دێنن

—–—

گیانەکەی کاکەی! ئێتر بزانە تەکلێفت چەنیٚ گەورەو گرانە
ئێسە کە زۆریٚ باوڕیان وایە: ڕێگەی تۆ بە ڕاس، ڕێگەی خودایە،
ئەگەر نەختاڵیٚ لەڕیٚ دێن لادەیٚ، هەم گونابارى، هەم مشقوڵزمەیٚ
مشقوڵزمەی ئەو خەڵکە داماوە وا بەرەو هەر لا پا ئەنێن داوە
وا بۆگنە هاوڕێت بە دڵو بە گیان هەرچەنیش خەتەر فرەی هەس بۆیان
بە «دێن» ئەزانن: کردەوەو قسەت یانیٚ: بۆیتەسە: «شاهدو حجّت»
یانیٚ: «نمۆنەی عەینیٚ لە بوٚ دێن». کە وابیٚ، عەیبیٚ، کەسنیٚ لە توٚ دێن،
زیاد لە خەیانەت بە خوٚتو بەشەر خەیانەتیچە بە خواو پەیغەمەر
چۆن وائەزانن: ئەوە خواییە پەیغەمبەری خوا ئەوەی هانیە
(بۆیە، ڕێبەرگەل، خراو بن یا خاس حەساویان لە تەک مەردما جیاس)

—–—

گیانەکەم توخوا تەکانیٚ بە خوٚت: لە داوی شەیتان ئازاد کە ئەستوٚت
بەر لە گ کاریٚ لە ڕٚەنگەل دەمار کە هەزار جوٚرە خوٚت بکە ڕزگار

به سه‌یقه‌ڵ «اخلاص»، هه‌مده‌ر، هه‌م ده‌رۆن … له له‌شکر شه‌یتان، ناساز که‌و چه‌تۆن
له «ناته‌بایێ» ـ به هه‌ر جۆرێ بێ ـ … زه‌ره‌ری دنیاو قیامه‌ت وه بار دێ
خۆت‌و یارانت، یه‌کدڵ‌و زمان … خوا ڕازێ که‌ن‌و شه‌یتان دڵگران
شه‌ڕی ناکۆکێ‌و ده‌سه ده‌سه بۆن … زۆر جار، زۆرتره له «له‌سه‌ر نه‌چۆن»
له باتێ تون‌و تۆڕه‌بۆن، تاوێ … له‌ڕێ «حکمت»و بنێ هه‌نگاوێ
ئه‌ر به حیکمه‌ته‌و، ده‌ردی چه‌ن هۆگر … ده‌رمان نه‌کریا ناوێ، جۆرێ‌تر
هه‌رچێ، بێکه‌ن‌و بێژنی، زۆرتر … شه‌یتان نێوانتان ئه‌کا ناجۆرتر
ناکۆکێتان بۆ دێن‌و بۆ مڵه‌ت … هه‌ر وه‌ک بۆ خۆتان، زه‌ره‌ره‌و نه‌گبه‌ت.
جا گیانم ئێسه نه‌وێته به‌رپه‌ڵ: … هه‌ڵبگرێ باری ناکۆکێ ئاوه‌ڵ،
هاوار ده‌سه‌ڵات وه ده‌ستت که‌وێ … له ده‌ست ڕۆژی نه‌یار چۆن ئه‌وێ!
بزانه: ئه‌گه‌ر بۆ ڕه‌زای خواوه‌ن … ئازاد که‌ێ دڵی له ماقۆڵێ به‌ن،
ده‌س که‌سێ ماچ‌که‌ێ، سونک بکه‌ێ قێن … ئه‌وه وا ئه‌شکێ، نه‌فسی تۆس نه‌ک دێن

—

په‌نا به خوا گه‌ر ناکۆکێ دو یار … بۆینێ‌و نه‌وێ په‌شێو خه‌مبار،
به دڵ نه‌کۆشێ بۆ خۆشێ نێوان … شێوه‌و ڕات ئه‌دا له «ینزغ» شان

—

ئه‌ر موسوڵمانێ له دۆر، یا نزێک … له ڕێگه‌ی تۆ مه‌کته‌بت ته‌رێک،
به اخلاصه‌وه خزمه‌ت کاو، چه تۆ … وه غه‌یره‌ی دانێ نه‌ک وه برای خۆ،
بزا: له ڕێ خوا دڵت بێگانه‌س … له نیه‌تتدا خه‌ڵێڵه‌یێک هه‌س:
بۆ ده‌سه‌ت، ده‌ست گه‌ره‌که‌و حورمه‌ت … نه‌ک له ڕێ دێنه‌و به مه‌ردم خزمه‌ت.
ئاخر دڵسۆزێت بۆ خه‌ڵک بێ نه‌ک خۆ … چۆن تۆڕه‌ی، که‌سێ خزمه‌ت کا وه‌ک تۆ؟
حه‌کێم، کاری بۆ: کێ هۆی ده‌رمانه … مه‌به‌ستی، ده‌رمان نیه، گیرفانه
خوه‌شه‌وێسێکت وه ده‌ریا که‌وێ … قه‌ڵسی، که‌سێکی وه فریا که‌وێ؟

—_—

له زۆر لا له ته‌ک مه‌ردمی هه‌ژار … هه‌ر گه‌ڕه‌و درۆ، ته‌وهێنه‌و ئازار
ته‌نیا ڕۆچنێ به‌ره‌و تێشکی تاو … به‌ره‌و خۆشبه‌ختێ بۆ خه‌ڵکی داماو،

تۆی و هاوڕێگەل ڕاس و دڵپاکت — هاواڵگەلی بێ تەماو بێباکت.
بۆیە براتان ئاوا لەم دۆرە — چاوی ئاواتی، هەر بەرەو ژۆرە:
خودا لاتان با لە هەواو هەوەس — بەر لە ئازارێ هەر کەس و ناکەس
ئاخر دژمنی نیە بتوانێ: — بگلێنێ وێنەی هەوا انسانێ.
بەخوا نەک تەنیا وڵاتەکەی خوەم — بۆ هەر لا تەنیا ئێوە شک ئەبەم.

—-—

دەێ جا سا ئێوەو غێرەتی خۆتان — بە جەڵادانی ئێمان و خۆتان،
ببن بە ڕەحمەت بۆ کوردەوارێ — دەرمان کەن هەزار دەردی هەژارێ
کارێ کە لە دەس براتان نایێ — ئێوە ڕێکی خەن بۆ «هەمو لایێ».
ئاخر ئێسا نە -پێچەوانەی زۆ- — تەنیا گەڕەکێ بەوجۆرە ساز بۆ،
کە سەرمەنزڵی «عشیرتک» بێ — بەسە، کە تەکان باتە هەمۆ جێ
یانێ: هەر ساز بێ کۆمەڵێ بچۆک — لە گش بارەوە جوان و ئێسک سۆک:
«قسطو برایێ، گیانی بێ و، تێنی — لە ئەمرو نەهیی دێنێ، پەڕژێنی»:
(هەمۆ کەس، کەس و ئاگادار لە یەک — نە زاڵمێ وێڵ، نە مەزڵۆمێ تەک)
(لە ناو ماڵ یا دەر، نەختێ ناحەساو — هەڵکەوێ، گشکەس وەک کەس بێتەجواو)
(لفێ، هاواڵێ، بۆچکێ، هەر کەس — زڵمی دێ، هەمۆ بۆی ببنە هاودەس)
(نەبێ منداڵێ لە ڕەنێ، بۆیێ — دڵی ناسکی، لێ نێشێ سوێیێ)
ئێتر لە گلا ئاسان تێئەگەن — کەمتر گۆڵ قسەی گزبازگەل ئەخوەن
ئەوساکە، هەموان تێئەگەن: هەر دێن — ژیان بۆ انسان ئەکا خوێنشێرێن،
چۆنکە کەوتە دەر: لە مەکتەبگەلتر — هەر کاسەی بەختی بەشەر بۆ کەلتر.
ئێتر لە دنیای ئیمڕۆژا هەر چەن — دەسدارو دەسبڕ زۆرو درۆ کەن،
ئەگەر پاش «تبلیغ» کارت بگەینێ — بە جۆرکردنی «نمۆنەی عەینێ»،
لەبەر کەرەسەی زۆری تێگەیێن — مەردم ناکرێن لە بێستن و دێن
ئەگەر بتوانن بەنّەگەل دنیا: — مەردم بتارنن لە تەبلیغ تەنیا،
کاتێ، حاصڵی تەبلیغ وەدێ هات — پێلەو پاڵ و پۆڵ، فرە کار ناکات
کەس نایژێ: «حوسەین چێ لە نوێژ داوە؟!» — «عەلێ بۆ لە ڕێ مزگەوت کوژراوە؟!»

—-—

گیانەکەی کاکەی توخوا حەیف نیە:
بە لادان لەوەی کە بە کەیف نیە،
لادەێ لە ڕاێ خوا بەرەو لای شەیتان
هەرچەنیش بە قەدێ یەک تاڵە قەیتان؟
حەیف نیە: لە خوێ خوا نارەزا کەێ
بۆ تاوێ کە خۆت بەنەی هەوا کەی؟
حەیف نیە خەڵکێ ڕیە لێشێواو
لە هەزار بارەو مەظڵۆمو داماو،
بگۆڕێتەوە بە نەختێ هەوەس
ئەر نەبێ بەشەرێ، هەر بتدەن لە دەس؟
تو خوا حەیف نیە ڕەفتارت وابێ
صوێزێ پێغەمبەر لێت نارەزا بێ؟
نەک هەر نارەزا: خەمبارو پەشێو،
ئەوکاتە «ئەشهاد» بێنن بۆ حەسێو؟
تو خوا ئەم دنیا ئەوێنە بێنێ بۆت:
تاوێ پەشێوکەێ ئازێزی خواو خۆت؟
وەختێ بۆ دنیای وەک خەوو خەیاڵ
«ما عنتّم»ی لا گرانەو تاڵ،
لە سەرمەنزڵا چۆن بێژم نەژێم:
«بالمؤمنین رؤوف رحیم»،
لە ڕەنگی زەردو خەجاڵەتبارمان
لە هەوڵی پوچو ڕەنجی خەسارمان،
لە ڕسواییمان لەبەر چاو عالەم
چەن لە سەر دڵی، خەمان ئەبن جەم
(چۆن لە خۆ ئەکەێ ڕۆشنێ چاوێ
کە هەزار دنیا فدای، بۆ تاوێ؟!)

— —

تو خوا گیانەکەم با خەتای ئێمەش
بڕێتر نەکا لە ڕەحمەت بێبەش
بۆ ناشارەزا شێوەی پێشڕەوان
مایەس بۆ تەکان یا بۆ سڵەمان
جا تو خوا ڕازێت: بۆ دو ڕۆژی ژێن
ببیە هۆی لادان انسانێ لە دێن؟
یا: بۆ ناڕاسو، لە بیانۆ بەن
بەهانە بێ: خەڵک لە ڕێ خوا بکەن؟
ڕازێت: هەزار ساڵ عومرت خەڵات کەن
هەرچێ ئارەزۆی دڵت بێ پێت بەن،
بەڵام ڕەفتارت وەها بێتە بەر:
کەسێ، جنێوێ باتە پێغەمبەر؟

—

گیانەکەم تو خوا لە مێژە بە ناو
دێنەو ئەکریێ زڵمو ناحەساو
زیاتر لە دژمن، دۆسگەلی نەفام
خەڵک ئەتارێنن لە ڕێگەی ئیسلام
ئێتر با ئێمەش نەوێنە ئافەت
بۆ دێن، زیادێ نەکەێن لە ئۆمەت مەینەت
بۆ خاسان مایەی بەدناوێ نەوێن
حەساوێ وە سەر ڕێ خاسان کەوێن

—

توخوا با کاتی مردن لە باتێ
خەمی بێکەسێو بێدەسەڵاتێ،

مەلایکەی ڕەحمەت سەلاممان لیٚکەن
ئـازێزانی خـوا دەورەمـان لـیٚ بـەن
توخـوا بـا ئێـسە وا بـژێن، سـویٚ
ڕۆی دێنـی شـێوەی ئازێزمـان بـویٚ
ئێسەو، ئەو دەم بیٚ، کـردە، وە کـەلام
ڕۆمـان بـیٚ بێـژێن: ئـازێز «السـّلام»
مـەزرامـان وابـیٚ هـەتـا وە بـەر دیٚ
لـە دڵـی ئـازێز نـەنێـشیٚ گـەردیٚ
تـا هـەرچـەن ئێـسە ئێـژێن: السـّلام
کاتی خـۆی وە گـویٚ بیێـسێن وەڵـام
یـاخوا وابـێن: خـوا بێکاتـە کـاریٚ
ئـەو ڕەحمـەتـەمان زۆتـر لـیٚ بـاریٚ
یـاخوا وەهـا بـێن لـە تێکوشـانمان
خـۆش‌و، ئـاوا بـیٚ وڵـاتی جوانمـان
گەلمان لـە هـەزار دەردی بێـدەرمـان
بـە زۆری ئێمـان بگاتـە سـامان
بـە دڵـیٚ پـاکو پـڕ لـە صـەفـاوە
کـاتیٚ کـە لێمـان هـەر یـادیٚ مـاوە،
تا یادی کردێن بـە دڵ بـانْ هـەڵبـات:
بـۆ پێغـەمبـەرو ئـالی صـڵاوات

٦٨/١/٣ تەواوبۆنی، پاکنۆس‌و دەسکاریْ: ٤ی ڕەمەزانی ١٤١٠ سەعاتی یانزەو ئێمی بەیانیْ.

---

## ٢١٨- ئەی بارەقەڵا!

کاکـەلـیٚ زۆریٚ تێفکـرێم بـەشـکەم
تێگەم: مەبەستت لـە «ئـازادیْ» چـەس
نەک ئەو کاتە وا داوای کەیْ بۆ خـۆت
وا دەسـەڵاتـت بکـەوێتـە دەس

— —

بە سـەنْو سـۆزن شـێوەو کـردەوەت
لەو چـەن رۆژا وا چویتـە بـان قـەڵـا،
دێم: بـۆ تـۆش مـەردم ئـازادن بێـژن:
«ئـەیٚ بـارەقـەڵـا»، ئـەی بـارەقـەڵـا.

٦٨/١/١٨

---

## ٢١٩- سفرەی ڕەمەزان

ئـازێز وە ئـەمـرت فـەڕاشـی «هـلال»
دێـسان وسـتەوە سـفرەی ڕەمـەزان:
سـفرەی صـەڕافـیٚ، سـوالەتـی تـەن
فاڕوٚ وە چـەنـیْ سکەی زەڕی گیـان

— —

ئیکسێریٚ، دەسی زکەڕۆ جە مل        سفرەو، سگاریٚ جە دۆکەڵ کەرۆ
دڵیٚ پای ڕاش بۆ نە لەرزەکی تەن        تا ملەی گیانش مەتاوۆ بەرۆ

— —

بەرخیڵی ساڵیش ڕوچنەی چەمو گۆ        نە بەزمڕاوگەی دڵ، وستەنەو کار
ماچان: شاتری شەماڵ ساراو کۆ        ڕازنانەو وەفەڕ دەنۆ ڕەنۆ وەهار

— —

کوڵۆڵ دڵەی کەیل نە کلاچۆن، چۆن        «کوردەی لە هەر دۆ جەژن بێوەریٚ:»
نە گیانش ڕاشەن بەرەو بارگەی گیان        نە بەرەی چەمو گۆش بەرەو بەریٚ

— —

سەم سیامار «نەگبەتاوا» هەم        ڕێژنان نە دەمو گەڵۆی دڵ، تاڵیٚ
کێشیان هەم نەڕۆی دڵ هەم نەڕۆی چەم        پەردەی هەم دۆری هەم بێهەواڵیٚ

— —

نە دێمەن فەصڵیٚ ماچان وەهارەن        هەمێسان بێنیان بەرەی بێناییٚ
هەم چنی خەمی دۆریٚ ئازێزان        چنی ناق تەم گۆشەی تەنیاییٚ

— —

دەخێلەن خاوەن گیانو مانۆ خۆر        یاوە وە فریای ئیٚ ڕا گومکەردە:
دڵیٚ، دێل تەم هەوای تەنیٚ، دێل        نە کپخانەییٚ شەوەزەنۆ بەردە

— —

نە یاگەی شانای دڵو گیان نەسەر        خوانی وەهارو سفرەی ڕەمەزان
شان میواندار چۆن تۆن هەزاریٚ        چەنیٚ خۆشبەختان فەرماوی هاوشان:

— —

دڵی گرپەردەی سەبۆنی دۆریٚ        ڕێژنەی ڕەحمەتت کەرۆ گیانباران
بە بەشیٚ باشتر پەی یارانو من        جە منو یاران پەی منو یاران

— —

دڵ یاونی چەنیٚ هامڕاگەل مەینەت        وە خزمەت خاوەن چاوەی ئاوی ژێن

وه گیــان پڕژێنــی نگــایێش، دەردی دڵو گیـان یـاووٚ وه دەرمـان گـردێن

٦٨/١/٢٣، ٥ رمضان ١٤٠٩ پاکنوٚس و دەسکاریٚ: ٥ رمضان ١٤١٠، ٦٩/١/١٢

---

## ٢٢٠– ئیشتبا ئەکەیٚ

ئــەو مــاڵو شــتوٚ مــەکــەت کــە پێــت هــیٚ خوٚتــە

لێک هەڵ کە بڕان بە ئیشتبای خــوەت پــەیٚ ئــەبــەیٚ

نــەک وانــە؛ تــەنانــەت ئــەو تــەنــەت کــاتی ڕوێــن

پێت خوەش بیٚ نەبیٚ لە دەسی ئەدەیٚ ویڵی ئەکــەیٚ

٦٨/٢/٥

---

## ٢٢١– هەر سەر لە سەر گڵی تەنیا؟!

پێــت وانــەبــیٚ وەبــیٚ کــوڵی کڵــی دڵ هەر سەر لە سەر گڵ ڕێت بەرێتە مەنزڵ

ڕێت بنکە بنکەی گورگو گورگەمێـشە بەحرو زەلو کەنو کـەلـت لـە پێـشە

ڕێبوار دڵە لـە پـێش دەمو قـولو پـەل زاتــی ئــەویٚو وریــاییٚو کــەلوٚپــەل

خەتەر بە عەشـقی تاقـە یـاریٚ، چـارە بـە کـەڵکـەڵـەی یـاران دڵـت تـەیـارە

—

دڵ تا نەبیٚ گـوروٚی خـەمـی هـەژاران هەردیٚ لە دەردی دەردی دەردەداران،

نـە پـیٚ ئـەگـا گڕێکـی گیـانگـەشـێنیٚ نـە تـیٚئـەگـا چڕێکـی گـڕ وەشـێنیٚ

— —

ڕێبواری بوٚ بەهـەشـتی مـەنزڵـی دڵ؟ نەک گای بنەیٚ خول خوەی لە کوٚتەڵی گڵ؟

دڵــت لــە بــەر خــەمــی منالــە ڕوٚتــیٚ لایکەم لە خـوٚت ئـەبـیٚ پتـر بـسوٚتیٚ

ڕێت لا لەڕیٚ خوا خوٚشەوێسە، دەسـتوٚ خورتـوٚمی فیڵـە فێـرە بـوٚ دەمـی خـوٚ

لای خوات ئەویٚ، تون بگرە لای نەداران یەکێکە هـەر ڕیـەی خـوداو هـەژاران

—

گڕێ کەیێت وەهایە عیشقی خوایە — خەمی هەزار نەبێ گڕەی هەوایە

لەچێ هەوایە، دڵ بخاتە کاوان: — هەوڵو خەمی زڵم لە لێکراوان،

ئەمجارە لێت نوێژو ئەوانە جوانە — هاوارو سۆزی عەشقی عارفانە

وشتر بە بۆ هەتێوی بێبەشو ناز — شێر بۆ زلەی لە مافی بێدەسان ساز،

ئەنجا بەجێیە لێت موبارەکە، گەر — ڕێ پێغەمەرت ئاواتە بگریە بەر.

—

سا تاکۆ زارێ هەڵبڕێ لە هاران: — لە زۆری زۆرو زێڕو گەڕ تەیاران،

تا هەڵگڕێ دڵێ لە خەم هەزاران، — سەلام لە پێغەمەر لە ئالو یاران

٦٨/٢/٢٣

---

## ٢٢٢- بە ڕاسێ، زۆر چکۆلەێ

ئەبێنێ ملّەتێکی ڕێگە شێواو — تەکانێ بۆ شەکانی هیچکە نادەێ!

ولّاتێ وێڵ ئەکەێ بۆ تاقە ماڵێ! — کەسی کاکەی بەڕاسێ زۆر چکۆلەێ

٦٨/٢/٢٣

---

## ٢٢٣- ئاخ لە عەقڵی ڕێگەشێواو

ئاخ لە عەقڵی دوابڕیاگ ـ ئەو کاتە ڕێگەی ئەشێوێ ـ

لە خاوەنی دژمنێکە ناگەێتە قولیا چ دێوێ

٦٨/٢/٢٣ نیمەڕۆ، وەختی هەواخوەری لە کومەیتەکە...

---

## ٢٢٤- بۆ کێته؟

ئەگەر هەوڵت لە بۆ خۆتەو هەوای خۆت
بچۆ هەرچۆنێ پێت خۆشەو کرا بۆت
دەنا خۆتو هواڵت، تا لە ڕێگەن
وەها بار بێنە دەستانچۆ خەمەت کەن
(چەشەی ئەمڕۆی مەزەی نانو کەبابێ
سبەینێ چۆن بە نانو دۆیە دابێ؟)
نەکا صۆزێ لە لارێ یا نەزانێ
ئەتۆش دێواری زەبرو زەنگێ دانێ
لە ترسی «چۆن؟» لە زەلکەی زۆرێ ڕۆچێ
لە ترسان کەس نەوێرێ بێژێ: «بۆچێ؟»
لە مەردم تۆش ببێتە باری نەگبەت
لە خۆیشت پاشە ڕۆژان بێتە مەینەت
بڵێین دنیات بە هەر جۆرێ وەسەردا
لە مەرگەو جا قوڕی کوێ کەێ وەسەردا
کوڵۆڵ: ئێستا بەهێوای ڕای خوداو خەڵک
سبەینێش شەرمەزاری لای خوداو خەڵک

٦٨/٤/١١

---

## ٢٢٥- دژمن مەخە چەپڵەڕێزان

ئەگەر دژمنی نیعمەتو خەڵکیو خۆت — ئەوەندە بخۆ تا سکت هەڵئەماسێ
دەنا مەیکە کارێ کە: لێت نەفسو شەیتان — بکەن چەپڵەڕێزان: چ بارگێنی خاسێ!

---

## ٢٢٦- فەرقتان چیە؟

ڕۆڵەم ئەگەر لە خەرجی هەڵەو زیادە لانـەدەیْ

پڕ دەبێتـە چـیْ لـە لاوەیـە: ئـازای‌و پۆچـەڵـی،

فەرقت چیە لـە تـەک ئـەوە وا بیـری، مـادّیـە؟

ئـەو دێلـی بیـری دژمنـە تـۆ دێلـی کۆتـەڵـی

٦٨/٤/٣٠

---

## ٢٢٧- کێ خاوەنی دڵە؟

کـێ خـاوەنـی دڵـە؟ کـزەڵـۆکێکی گۆشـەگیـر؟

هۆرتەو بـەرە نـەکـردە لـە ئـاواتی جـەز ئـەسیر؟

نە، گیانە! دڵ، کەسـێ هـەیـەتـی کـرژو تونـدو تـۆڵ

بـۆ گیـان‌و لاشـە، قیامـەت‌و دنیـا، بـە کـارو، ژێـر

سەرسەخت‌و دژ لە ناحەق‌و گەڕ، سەرخەوێن لـە حـەق

زۆردار لە سەر هەوای تەن‌و ڕۆشـن بـەفـام‌و بیـر

بێواز لە زل، لە گـەل ئـەوە بێـدەسـتە کـۆکو سـاز

وەک شێر لە حاستی زاڵم‌و وەک پەز لـەبـۆ فـەقیـر

عەقڵی، لەسەر هەواو هەوەسی، سوارو ئاغـە، نـەک

وەک عەقڵی دێلی دنیە لـە بـۆ نـەفسی پـەس گزێـر

دڵ، گەش لە خۆش‌ویستنی خواو چیْ بەرەو خوداس

ڕاوێژو هەوڵی بـۆ وەتـەن‌و خـەڵکـی، جـوان‌و پیـر

نەسرەوتـوی هـەزار خـەم‌و دەردی گرانـی خـەڵـک

چیْ تۆش‌و سەخت‌و سەخڵەتە، لای هیمـّەتـی، هـەویـر

دڵـسۆزی ملـّەتـی خـۆو، پاشـان، هـەمـۆ بـەشـەر

لای‌کەم بە قەد تەنێ تـەنـێ، خـەڵکـی کـەوێتـە بیـر

ئەنجا بەجێس: ئومێدی بە خـۆش‌وێـستن‌و ڕەزای
خـواو، بـۆ قـەفـەز شـکاندنیٚ، خاسـانی بێنـە پێـر
ئەوسـا دڵـی، بـەرەو جـەمـی یـارانی خۆشـەوێـس
بفڕیٚ، لە گەێنە جەرگـەی ئـەوان بـیٚئومێـدی، گێـر

—

وابـــیٚ، دڵـــت پـــەڕاوە لـــە ئێمـــانی خواپـــەســـەن
عیرفان بەڕاسیٚ، بەشتە، نە وەک بەعزیٚ شـێخ‌و پێـر
ئەوسا بـە سـۆزو تێنـەوە قورعـان‌و نـوێژی خـۆت
بخوێنـە، وەک لـە زڵمـە، گـوڕەت گێڤـەگێڤـی شـێر

—

جـا گیانـە وا بـژیٚ‌و بـڕۆ، نـەک بـەلاش‌و، نـەک
وەک خـوێنمژان بـەرەو کـەنـەڵـانی گرفـت‌و گێـر.
چەن خۆشە گیانە مردنی وا، وەک عـەلـیٚ‌و عومـەر
یـــا بـــانترت بـــە پێـــرەو بـــێن! نعـــم ذا المـــصیر

—

گیانێنـــە! ســـا تـــەکـــانیٚ بـــەرەو مردنـــیٚ بـــەرەو
مزگێنیـــیٚ وەهاێنـــەو صـــلّوا علـــی البـــشیر
٦٨/٧/١٥

---

## ٢٢٨- پەڕۆی بە زێن مەکە

بـــۆ پـــەڕۆ کردنـــی بـــە زێـــن
بیـــانۆی پێـــریٚ مـــەهێـــرە
پێـــریٚ مـــار ئـــەکـــا ئـــەژدەهـــا
شـــێر، کـــە پێـــر بـــۆ «پێـــرە» شـــێرە
٦٨/٧/١٦

## ٢٢٩- كوردستانی جوانم

چەنای چەن ساڵە كوردستانی جوانم ... لە دۆرێت عالەمم لێ بۆتە زیندان
مەگەر ناوت لە ناو ڕۆژنامە مۆچڕك ... بخاتە گیانو چاو بێنێتە گریان

ـ ـ

ولاتی خۆشەویسم یا خودا قەت ... شەڕی زۆرکارو خوێڕێ لێت نەکا کار
خودای ئەو خەڵکە خۆتو ڕۆڵەکانت ... بپارێزێ لە فێڵ و داوی بەدکار

ـ ـ

لە هەورامانو سارالێت لە بارتر ... لە کوێ بێرم کە پێ خۆشکەم دڵی خۆ
گرانە تا بەهەشتی خوا پەیا کەم ... کەژو کێوی بە جوانێ ئاویەری تۆ

ـ ـ

لە دڵ، تارانو دەورەی، ناگرێ جێ ... سنەو مەسناوو گریاشانو قارت
بەڵێ ڕاسە شەمێران خۆشە ئەمما ... هەموی قوربانی بستێ دەیمەزارت

ـ ـ

نە بەندێ، گەر وەکی باپێرە گەورەم ... بە ئازادێش ببم مێوانی تاران،
دڵم ئێژێ: قەزای بەردێکی سەخناخ ... لە سەر تا خواری تارانو شەمێران

ـ ـ

ئەمن فاشیستو بەدخوای خەڵکیتر نیم ... موبارەک بێ لە هەرکەس نیشتمانی
بەڵام بۆ من هەمو ئێران بە مولکێ ... فدای وێڵەی سنەو مەسناوی جوانی

ـ ـ

وەتەن ئەڵحەق بەهەشتی ڕۆی زەوینی ... ـ گەلت ـ داخی بە جەرگم ـ زۆر هەژارە ـ
زەلانی پاییزی ئامانیەت بۆ ... دڵی ژاکاوی دۆرێ، بای بەهارە

ـ ـ

بەڕاس لایقتە کوردستانی جوانم ... گەلێ ژێرو نەترسو کرژی ئێمان
لەگوێت هەر نەبڕێ یاخوا دەنگی صەلوات ... لە بۆ پێغەمبەرو بۆ ئال و یاران

٦٨/٧/١٦

## ٢٣٠– هاوار له دەهۆڵ بۆن!

هاوار لـه دەهـۆڵ بـۆن دەنْزلـی هولـۆڵ بـۆن

نـاوداری وه بـیٚنـاو دەسـداری کولـۆڵ بـۆن

لای خـەڵکـەوه ئـازا لای خـوا گـەن‌و خـوێڕیٚ

دەوری پڕی دۆسان مردن گـەیـیٚ چـۆڵ بـۆن

ئـەی خوایـه دەرۆنـیٚ سـازتر لـه ڕۆاڵـەت

زۆرتر لـه دەم‌و دەس ئێمـان تـون‌وتـۆڵ بـۆن

٦٨/٨/٢٧

---

## ٢٣١– گیانەکەم هەژار!

گیانەکەم هەژار بەو شـەرتـه لـه کـار

تەمەڵـیٚ نـەکـەی چـەن خوێنـشێرینیٚ

یـا خـوا ڕۆزگـاریٚ بگـا ڕزگـار بـیٚ

لـه خـەم‌و مـەینـەت لـەلانـشێنیٚ

یـاخوا ئـەو دەمـه وەک بـڕیٚ پۆچـەڵ

خـۆت لـه هـەژاران بـانتر نـەوێنـی

٦٨/٨/٢٧

---

## ٢٣٢– قوربانی حوسەینت بم

لـەو دێـوی هـەزارشـاخی دەوران‌و درۆ، دەنگـت

مـردۆ لـه تـەمـاو ترسـا، دێنێتـەوه جـۆڵوجـم

ئێستاش له هەناسەی تۆش شێن‌بۆن‌و گەشـەی مـەزرای

ئـازادەگـیٚ‌و غێـرەت قوربـانی حوسـەینـت بـم

٦٨/٩/١٣

## ٢٣٣- جیاوازیٚ مەخە ناو خێزان

کـەسـم ئامـان لـە نـاوخێزانی ماڵـا
بـە هـیچ جـۆریٚ جیـاوازیٚ مـەهـاویٚ

بە نازو، ژیٚنەوەر لیٚک هەلٚ نەتاکنیٚ
لـەوەڕویٚرکـیٚ هـەتـا تاقانـە لاویٚ

هەموٚ نانیٚکی وشکیٚ خوٚنو وەک یەک
نە یەک تا چیٚنو یەک یەخنیٚ پلٚاویٚ

زیـادە، ئـاخری، بـوٚ خوٚشـەویٚـست
ئـەویٚتـە نـەگبـەتو خێریٚکـی نـاویٚ

ئەگەر ژیٚری و موسولٚمانی، لە مالٚا
هەناوی حورس و داوی کیٚنە ماویٚ

مەکە خویٚنتالٚی لای خوا خوٚت و مالٚت
بە دوٚجوٚر بوٚنی تامیٚ، نازیٚ، باویٚ

— —

بە تبعیض و، بە رٚوٚ درژیٚ، بەدەس خوٚ
لـە شـەیتـان داویـە نـاو مـالٚوٚ داویٚ

هەموٚ خێزانی مالٚت خوٚش گەرەک بیٚ
ئەگەر کەیف و ڕەزای شەیتانوٚ ناویٚ

بە ڕاویٚژو بە حیکمەت بیٚنە سەر ڕیٚ
ئەگەر یەک لاڕیە، نەک یاروە خاویٚ

—

بەلٚیٚ جوانە لە لای خوا زیادە بوٚ کچ
بە شەرتیٚ کوڕ بزانیٚ بوٚچە واویٚ

— —

لە مالٚت تاویٚ میٚوانی، لە شویٚن خوٚ
لە شەڕ مەیلٚانە شویٚنیٚ، بیٚریٚ، ناویٚ

دەخیٚلە وا بژیٚ: مردیٚ، بە دوٚتا
سەلامی دایمە بیٚ نەک ئوٚفی تاویٚ

٦٨/٩/٢٦

---

## ٢٣٤- نەویٚتە برا شەیتان

گیانە دوٚر لە توٚ ئەر «اسراف» ئەکەیٚ
ئامانە ئیٚتر بە «تبذیر» نەگەیٚ

ئەر نەفسی نەوسن، بوٚ زیادەرٚەویٚ
زوٚرت بوٚ بیٚریٚو وەشویٚنی کەوی،

ئیٚتر ڕژانن چ تامیٚکی هەس
تا بیٚخەینە پای نەوسی نەفسی پەس

ڕشتن، هەر زەرەر لە بەشەردانە
بوٚیە «مبذّر» برای شەیتانە

٦٨/٩/٢٧

## ٢٣٥- سامی بەندەگێت

چێ کەیفو نۆشو نازو حەساوە هەمۆ فدای
تاوێ بە فامی زەینو دڵەو تامی بەندەگێت
ناوچاوی شێرە بۆ مڵە، بۆ مەستی دەستەڵات
شێوەی ئەسێرێ نیشتوە لێ سامی بەندەگێت
لای دڵ، تەواوی خۆشێو دەسدارێو زلێ
قوربانی سۆزو ئێشی جەفاو زامی بەندەگێت

٦٨/١١/١٩

---

## ٢٣٦- خەڵاتی ئاوات بۆ تۆ ئاسانە

وە چلەی زۆسان لە هۆدەی گەرما — نانو، پڵاوو گۆشتە لە پێشم
لە خەڵکیش وایە: وەک خاسانی خوا — منیش مەینەتو زیندان ئەکێشم

- -

دانگەڵم تازە کێشاوەو خوەراک — لە سەرسوڕنە خۆش ئەکەم وەک ماجۆم
تێتە بەرچاوم حاڵی هەزاران — منداڵو پیری برسێو مەحرۆم

- -

تێتە بەرچاوم کۆرپەیێ، دایکی — ترێتی نانو ئاوی بۆ دێنێ
پیرێ، تێربۆنی جارێ لە سائێلە — یا پێرخەنێلە بە خەو ئەوێنێ

- -

بێتە بەرچاوم سارده کەلاوەی — چۆڵی خێزانی برسێو بێپۆشەن
خەم دایکو باوکەل خۆ لەبێرەو چێ: — بۆ منداڵ برسێو ڕۆتەڵیان چەبکەن

- -

بێتە بەرچاوم ئازێزانی خوا — لە شێوی «ابوطالب»دا چەن ساڵ
ناوکە خۆرمایان وەگیر نەدەکەوت — بێکەنە ئاردو بێدەنە منداڵ

- -

دێتــه بــەرچــاوم هــەزاران دەردی
گــەلــی هــەژاری ڕێگــه شــێواوم
بـۆ ڕزگـاریێـان، وائـەبـۆ، نـەمکـرد
لـه نـەفـسی کـرژو لـه دڵـی خـاوم

— —

ئـەنجـا لــه گوێمـا ئـەزرنێتـەوە
دەنگـی ماشـەڵـای مـەردمـیێ دڵپـاک
هەر بەۆنـه ڕازێـن: خـەیانـەت ناکـەم
خۆم نەفرۆتوتە چنێ خـوەڵو خـاک!

— —

وەلـیێ مـن بێـری خـەڵکـی ڕێشـێواو
تامـازرۆ بـۆ ژەمـیێ خـەپلـەی گـاڵ،
پڵـاوو گۆشـتو، ماشـەڵـاو بـەخبـەخ
لـه تـامی دەمـی دڵـم ئـەکـا تـاڵ

— —

خوایـا چـه بێـژن خـۆ خـۆم ئـەزانـم
چـەن شـێوەم هـەڵـه لـه ڕێ خاسـانه
لـەوە وا ئێـژن خاستریـشم کـه
خـەڵـاتی ئـاوات بـۆ تـۆ ئاسـانه

— —

به ڕەحمەت، خۆمو هەر که دڵسۆزی
ملّـەتو، خـەڵکـی کـزو هـەژارە،
بتەو که له ڕێ سەختـی خۆشبەختـی
بۆ خەڵکو، مەینەت بـۆ هـەر کـه لارە

٢٢ی بەهمەنی ٦٨

---

## ٢٣٧– دڵ، کامەیە؟

دڵ وەختێ دڵه به خۆشەویسێ بفـڕێ
ئەرنه دڵی چێ تەنێ چنێ خـوڵو گڵـه

٦٨/١٢/١٠

---

## ٢٣٨– کەی تێگەیێن، به کارە؟

ئـەر تـێگـەیێنـێ کـاری کـردە دڵ
جـا تـێگـەیێنـەو فامـەو پـێگـەیـێن
ئـەرنـه نـەزانـێ گـەلـێ باشـترە
ئەر هەر بـه تـەنیـا زەێنـه تـێگـەیـێن

— —

ئـاخر ئـەو کـەسـە زەینـی نـەزانـە
نـاتوانیٚ زۆر بـا لـە مـەردم زەرەر
وەلیٚ زەینـیٚ سـاز دڵ نـەوێ لـە تـەکیـا
ئەگونجیٚ ببـیٚ بـە شـەڕ بـۆ بـەشـەر

— —

بەڵام هۆش خوەت بیٚ: دەردی تەمەڵـیٚ
نـەتخاتـە سـەر بـار لـە زانـێنگـەڕان
شـوانیٚ بـە بـۆ ڕان نـەک بوێتـە مـەڕ
کە وتیـان: مـەبـە بـە گـورگیٚ لـە ڕان

— —

بـە ژێـریٚ بێـژن: مـردن خاسـترە
تا لە ماڵ حەرام ژیـوار جـۆر کـردن،
تـیٚئـەکۆشـیٚ تـا بژیـیٚ لـە حـەڵـاڵ
نەک هـەڵـاژیٚ بـۆ لـە برسـان مـردن

— —

تۆیش گیانی کاکەی! بۆ خاسیٚو، خزمەت
تـیٚکۆشـە هـەرتـا زۆرتـر بزانـیٚ
وێسـتت خزمـەت بـۆ بـۆت عیبـادەتـە
لاقـیٚ بـۆ زانـێن هـەڵێنـیٚ، دانـیٚ

٢٣ ڕەمەزان ١٤١٠

---

## ٢٣٩- «التّحيـّات لله»

«تولّنا»ت لـیٚ قـەبۆڵـە ڕێـت ئـەگـەر ڕیٚ خـوداس
ئەوسا بە «إذن»ی خودایەو، خێرە: چێت بێتـە ڕیٚ
بێـرت لـە چـیٚ ویٚڵـە، بـۆچیٚ وا پـەشـێوە دڵـت؟
خـۆ «التّحيـّات لله» سـا لـەمو لـەو گـەڕیٚ

٦٩/١/٣٠

---

## ٢٤٠- چیٚ ئەکا زاری وە بیٚ دڵ

زۆری فەرقە «خوا خوەشت کا»ی بۆ تەعارف تا دوعای
دایک و باوکیٚ بۆ نەجاتی خۆشەوێسێکی نـەخـۆش
وا مـەزا: صـەت «الـسـّلام»ت لایقـە بـۆ یـەک وەڵـام
چیٚ ئەکا زاری وە بێدڵ، بیٚ تـەنانـەت بێـرو هـۆش
خوایە سوٚی سەودا لە دڵ دەرکەو گرێکی تێخـە وەک
دڵ پەپۆلە بۆ چرای دڵ پڕ لە جوٚش بێتو خـوروٚش

٦٩/١/٣٠

---

## ٢٤١- خوایە! ئەزانم: چەن ناقابلم

خوایـا ئـەزانـم چـەن ناقـابلم
بـە شـێوە لـە ڕیٚ ڕێبـڕان کلـم
وەلـیٚ ئـەزانـیٚ زانـای دەرو نـاو
سەرەڕای گەنیٚ و خەتای بیٚحەسـاو،
چلوٚنـە هێـواو ئـاواتی دڵـم
دڵـی بـۆ دێـنو ملـّەت پـڕ کـوڵم
لـە ئـەم تروٚسـکە، هێـوام بخـە کـار
نـەک بێفـەڕیٚو شـێوەو ڕەفتـی لار
بێکـە چرایـیٚ بـۆ خـەڵکـی دامـاو
بـەرەو ڕێکـە ڕای لـە دروٚ شـێواو
لـەو ڕوٚژەیـشا وا ئـازێزانی خـوٚ
ناکـەیٚ وەک زلـەو خـوێنمژان تـڕوٚ،
بۆ خوٚمو هـەمـوٚ هـاوڕێی هـاودەردم
بۆ هەمـوٚ ئوٚمـەت بـۆ تـەواو مـەردم،
وە نـوٚرێکی کـە وەک مانـەشـەویٚ
مەنزڵ وە مەنزڵ وە پێـشمان کـەویٚ،
تـا لـە دوٚ ڕیـان لارانو ڕاسـان
بمـان گـەینێتـە مـەنزڵگـای خاسـان
جـا وە شـوکرانە دڵمـان خـەنـان کـە
دەنْمـان زەڵـاڵو زوانمـان ڕەوان کـە
خەوش کەێن بەهەشتت هەزار هەزار دال
بە صەڵوات لە سەر پێغـەمبـەرو ئـال

٦٩/٢/٢٤

---

## ٢٤٢– هەر وەێته: «فی اهله مسروراً»

ئــەر دایمــە لــە تــەک خێزانــی ماڵــا خۆشی ئەبوێرێ‌و سەرمەسی هەوایێ،
جارجار ناکەویە خەمی مـەردم، کـەیٚ لــە «فــی اهلــە مــسروراً» جیــایێ

٦٩/٢/٢٩

## ٢٤٣– هاوار لە داهاتۆی هەوەس!

دەخێلــە هــەوەس نــەدا لــە کــەلــەت: کـەسـیٚ لـە قسەت نـەکـا لامـو جـێم
هەوەس مـاقۆڵیٚ کـەمکـەم ئـەتبـا تـا: «انّــــک أنــــت العزیــــز الکـــــریم»

٦٩/٣/٣

## ٢٤٤– کەی لە تامی «السـّلام» ئەگەیێ؟

کوا گیانە ئەو سەلامە سـەلامـە لـە خۆشـەوێـس
کاتیٚ کە خزمەتی خوەشـەوێـسی بـە دڵ نـەکـەیێ
بۆ خەیری خەڵکو دێن وەرە چش کە لە ماڵو گیان
ئەوساکە جا لە تـامو مـەزەی «الـسـّلام» ئـەگـەیێ

٦٩/٤/٢

## ٢٤٥– نوێژو سەلامێکی تام هەمێشەیێ

خوایە لە ژێـری هـەورو تـەمـی پـۆچێو خـەتـا
جوٚلانی زارو لەش، دڵی، چـوٚن پـیٚ گـەشـێتەوە
وا خوایە ژەنٚ لە دڵ بە پەڵەی هەوری ڕەحمەتت
لاوە، چەمی لـە ڕۆی خـوەشـەوێـسێ کرێتـەوە

جارێ لە ناو کڵی خوەشەویسی، خەڵـات کـە دڵ
نوێژو سەلامێ، تـامی لـە بیـر هـەر نـەچێتـەوە
٦٩/٤/٥

---

## ٢٤٦- کەی لایقەن سەلامی من؟

ئەر نازی خۆشەویسی نەبۆ، ڕەحمەتـو خـوای
کەی لایقەن سەلامی منـی هیچو پـوچی خـام
ئەونە جـە خـواوە جوانـەنو، وا لایقـەن وەتـۆ
ئازیزەکەی خوەمو خوەشەویسانم «السّلام»

---

## ٢٤٧- چەن خوێنشیرینی هەژار!

چەن خوێنشیرینی چەن خوێنـشیرینی
گیانەکـەم هـەژار چـەن خوێنـشیرینی
چـەن خوێنـشیرینی کـە بـێفـڕو فێـڵ
نانـت دەرتێـری وە زۆر شـانو پێـڵ
لە شوێنی ژیـوار بـە زەحمـەتو کـار
خـۆ ئـەڕەتێنـی بـێدەعیـەو دەمـار
دەسهاتت ڕۆخـۆش تێریتـەو بـۆ مـاڵ
لاشـە کوتیـاگو مانـدو شـانو بـاڵ
لە خۆی خۆشت ماڵ پـڕە لـە خۆشـی
نە درز ئـەویتو نـە نـاز ئـەفرۆشـی
ئیـسە هـەژارگیـان بـەرچـاوت پاکـە
فامـت بـۆ بـڕێ لـە عـەیبـەل چاکـە
لە گەوجـێ بـڕێ خـاس ئـەوێ حـاڵێ
لـە حـاڵ پـۆزنو لـە خـوێنی تـاڵی
تێئەگەی: بـڕێ گـەوجـە دەوڵـەمـەن
چۆن وەخۆ گرتن خۆی ئەکـا وە پـەن
یـانێ: قیمـەتـی وەک بـڕێ حـەیـوان
ئەگۆڕێ خشڵو، زینو بەرگـی جـوان
تـێئـەگـەێ: چـەنـێ نـەفامـە کـە خـۆ
لـە بـەر پـۆڵ بـانتر ئـەزانـێ لـە تـۆ
هەژارگیان صوزێ کە بۆی دەوڵەمەن
دەسمە داوێنت خـۆ نـەکـەێ وە پـەن
٦٩/٤/٥

---

## ٢٤٨- کچم! خۆتو غێرەتت

ڕۆڵەم! کچی نازەنێنم! یاخوا خراوێت نەوێنم!
وریای خۆ بێ لە فەنبازگەل: دژمنی دۆسنوێنی گەل،
کە: وە تەتەبەخێت نەکەن یا وە گیان مللەتت نەخەن

—

بزانە: دوژمنت زۆرە ڕێشیان وەک خۆیان جۆر جۆرە
یەک ئەتیەوێ: وەک کەلوپەل یەکتر: بۆ خەیانەت بە گەل
ئەو ئەیەوێ: وەوێلکە بێ بەرەو خزمەتێ خاس نەچێ
بشنێی بە لەنجەو نازەوە بە دەمی هەوەسبازەوە
بە ڕواڵەتیش تەکانێ بەێ بۆ بەزمی ئەو بێ گەرمی کەێ
ئەوتر گەرەکتی: خۆ سەنێن بنوێنێتو پەیڕەوی دێن
بەڵام نەک دێنی بە ڕاسێ: دێنی دژێ لارێو، کاسێ
بەڵکە دێنی سسێو خامێ دێنی خوێڕیەتێو نەفامێ
چە زڵمو دروس ببارێ دڵت دانەچڵەکێ جارێ

— —

جا کچم! خۆتو غێرەتت، خۆتو ڕۆحمت بە ملەتت،
خۆتو فامو تێگەیێنت: کرمێو پۆچەڵ نەبێ ژێنت

٦٩/٥/٢١

---

## ٢٤٩- دڵت چۆن دێ؟

بیسو چوار سەعات ئەڕوا بە کارو خەوو خواردن
کە هەر بۆ تەنێ لەشنو خەیاڵو خەوی دنیا
لە بۆ گیانو، بۆ ژێنی بەڕاستێ دڵت چۆن دێ
درێغی عیبادەت کەێ دو سێ ساعەتێ تەنیا

٦٩/٦/٣١

---

## ٢٥٠- چ ڕەحمەتێکی فداتم

چ ڕەحمـەتێکـی فـداتم کـە هــەر سـەلامـێ لـە تـۆ
لە بۆ بەشەر یەکێ خەیرەو هەزار بەرەکـەت
سەلامی خواو مەلایکەو بەشەر هـەمـۆت پێشکەش
هــەتـا هــە: بــێ خــەوەرو ڕێبــڕو کـلا لــەڕیــەت
٦٩/٦/٣١

## ٢٥١- پێم سەیرە!

کەیفی خوەیە چە دژمنی هەس دێنـی خـوا، بـەڵـام
ماتم بـە ئـەم گ دۆسـە لـە هـەرلاوە، چـێ ئـەکـا
پێم سەیرە بەختی خەڵکی کوڵوڵ چۆنە هەرکە تـێ
هەر خزمەتی ئەکـاتو چـە ڕۆژ ڕەشتـری ئـەکـا
٦٩/٧/۴

## ٢٥٢- لە خۆ دەرنەچی

ئامان هەژار گیان! لـە خـۆ دەرنـەچـی — کاتێ خوا یـار بـێ بوێتـە دەوڵـەمـەن
ناوچاوت وە دێـو نـەکـەێ لـە هـەژار — ملــت وەڕاجــەو، دڵــت وە تـــەوەن
ئــاخر فــرەیــان زۆتــر هــەژار بــۆن — ئــەمانــە وا وا بــا لــەخــۆ ئـەکـەن
٦٩/١/٢٧

## ٢٥٣- دنیا پردە بازە

بـا مـەکـە لـە خـوەت، ئـاوا مـەنـازە — وە خوەت! ئەم دنیـا وەک پـردە بـازە
تـاوێ لـە ژێـر پـای توێـەو تـاوێتـر — بــاوش ئــەکاتــەو بــۆ هــەنــاوێتــر
٦٩/١١/٢٧

## ٢٥٤- بیگری، مشتێکە...

چەن خاس ئێژێ کورد: نەفسی نانەجێب
بیگری، مشتێکەو؛ بەریەی، دەشتێکە
چوڵیش بێ: ماڵی ئاوای ئێمانو
حوببی هەزاران، وەک بەهەشتێکە

٦٩/١٢/١٤

---

## ٢٥٥- چۆن دڵت بڕوایی ئەدا:

ڕۆڵەم! چۆن دڵت بڕوائی ئەدا:
خەرجو ئەرکت بێ بۆ خێزانو ماڵ،
کە چێ هەر تەنیا ئەوْنەی خەرجەکەت
زەحمەت نەکێشی بۆ ماڵو منداڵ؟!

٦٩/١٢/١٥

---

## ٢٥٦- چ ئەتکاتە ئینسان ؟

چ حونەرێکە خزمەت هەر بە تەن: کارێ کە حەیوان باشتری ئەکەن؟
ئێمانو تەقواو تێگەیێنی جوان ئەوێ بتەوێ ئەتکاتە ئینسان

٤ی ڕەمەزانی ٤١١-٧٠/١/١

---

## ٢٥٧- ئیفتخار!!

پێم سەیرە: کاورا خۆشێ دنیا با تا ئیفتخارێ، ناوێ دەسبێنێ
ڕۆڵەی ئازێزی باتە کوشتن با وێنەیێ لە لێ لەلای بمێنێ!

جەژنی ڕەمەزانی ٤١١ ـ ٧٠/١/٢٨

---

## چەند تێبینی سەبارەت بە مەولۆدنامە:

١- کـاک ئـەحمـەد ئـەم مـەولۆدنامـەیـەی لـە زیندانـدا هۆنیـوەتـەوە کـە وەک خـۆی لـە وەسـیەت نامەکەیدا لاپەڕەی ٦ و ٧ ئەڵێ:

«... ئێستا تـەنیـا سـەبـارەت بـە مـاوەی بـەینـی (نـذر عبـدالمطلب) تـا سـەرەتـای هـاتنی وەحـیو هەروەها بڕێکی دیکەش شێعری پەخشو پەڵا باس کـراوە، وا ئـەزانـم ئـەگـەر بـە شـێوەیـەکـی بـاش کەڵکیان لێ وەربگێرێ بە یارمەتـیو بـەرەکـەتـی خـوای گـەورە، بـۆ سـاقو خـاوێن کردنـەوەی دڵو دەرونو قەرەبو کردنەوەی کەمو کوڕیەکان، کاریگەر دەبێ.

٢- ئەم چەند شێعرەی خوارەوە هەر لە سەر مـەولۆدنامـەکـەیـە؛ بـەڵـام بـە هـۆی ئـەوەوە پـەیـوەنـدی بە هیچکام لە بەشەکانی بابـەتـەکـەوە نـەبـۆ، هـەر لێـرەدا ئـەو شـێعرانە هـاتوە کـە دەقـەکـەی بـەم شیوەیە:

| | |
|---|---|
| **«تەنیا یەکیەکێ، لە دەوڵەمـەن هـەن؛** | **حەقیان دی، بە تۆن لە گشتێ ئـەکـەن** |
| **ئەوەی هـەڵ بکـا، چـرای بـەزەیـێ** | **زوڵمو زۆر تێکدا، نەگـەیـیو مـەیـێ** |
| **ئەبێ تێ بگا، بە هەسـتو بـەگیـان،** | **لە ڕەنجو مـەینـەت، لـە تـاڵێ ژیـان،** |
| **ئـەبـێ تـێ بگـا، دەردی بـێ نانـان** | **بە گۆشتو بە پۆس، بە ڕەگو ئێسقان.»** |

٣- بەداخەوە لە ١٢ غەزەل کە مەبەستی کـاک ئـەحمـەد بـووە بـۆ هۆنینـەوە تـەنیـا سـێ غـەزەڵـی ژمارە ٣و ٦ و ٨ لە زیندانەوە گەیشتۆتە دەرو.

٤- سەر دێڕی هەندێ لە غەزەڵەکان بـە فارسـی نوسـرابۆن؛ لـە بـەر ئـەوەی تـەواوی مـەولۆدنامـەکـە بە زمانی کوردی بو، ئێمە ئەو چەند سـەر دێـڕەشـمان کـرد بـە کـوردی. کـە دەقـی ئـەو سـەر دێڕانـە بە فارسی ئەمانن:

- جێگەی غەزەڵی٤ : حوادث شب، و سال میلاد مبارک

غەزەڵی ٦ : درگذشت عبدالمطلب

جێگەی غەزەڵی ٧ : تسلیت با مدیح محمّد و کمکش به ابوطالب

غەزەڵی ٨ : رسیدن جوانی از همان راه

جێگەی غەزەڵی ٩ : ارتباط ابراهیم و محمّد؟

جێگەی غەزەڵی ١٠ : ازدواج با خدیجه

جێگەی غەزەڵی ١٢ : شروع وحی، و معلوم شدن راز عجایب چندین ساله، و ...

بسم الله الرحمن الرحيم

«یەک» بۆ؛ یەکێ نەو. بێژگە خوا، کەسێ، نەو، باتە ژێر بار هەژارا دەسێ.

—

ئازێزان! با بەین با باڵی خەیاڵ: بگەڕێینەوە بۆ ساڵانی ساڵ.
لەو بەرزانە، لەو ئاسمانە شێنا، چاوێ بخشنین بە سەر زەوێنا:

—

هاوار، ئازێزان! مەرگتان نەوێنم، داخۆم خەیاڵە؛ یا خەو ئەوێنم؟!
دێمەنی ژیان، چەن گرژو تاڵە! چەن خۆری ئاوات، کزو بێحاڵە!
سەرانسەر دنیا، بدەیتە پاوە، چاو، چاو ناوینێ؛ ئەنگوستە چاوە!
بۆ هەر لا ئەچی، زۆردارەو بێزۆر! برێنی جەرگی مەزڵۆمان، ناسۆر!
ڕۆژی میللەتی داماوو هەژار، بێترۆسکە، وەک گیارەش بەهار!
قورسو، لاسارتر لە شەوگار پایێز! کڕو کپو لێڵ تاڵو درژو زێز!
لە ناو هەزاران کەلاوەی خاپۆر، یەکیەکێ کۆشکو قەڵای زەردو سۆر!
یەکیەکێ سەرمەس لە نازو نیعمەت! باقێ، برسێو ڕۆت؛ دڵ، پڕ لە مەینەت!
چرای پڕنوری «ئازادێ»، کە زۆ، پەیغەمبەرەکان هەڵیان کردبۆ،
تەواو کەوتوە لە ترۆسکەو گڕ، بە دەس دەسدارو دەسبڕو دەسپڕ.
فەساد لە هەر لای بەڕو بەحرەوە، وەک شەپۆلی شەو، مەوج ئەداتەوە.
لەوڵاتێکا بە ناوی «حجاز»، ژێن لە خەڵک، بێواز؛ خەڵک لە ژێن، بێناز؛
لە ئەم وڵاتەی پڕ لە داماوێ، شارێک دیارە؛ «مکّە»یە، ناوی.
لە چەن ماڵ هەڵمی دێزێو قازان؛ باقێتر، دۆکەڵ هەناسە سەردان.

بڕێک سەرگەرمی بەزمو، تاقیـان جـۆت؛ خەڵکی‌تر، لە خـەم، زەردو؛ ڕەشو ڕۆت.
بڕێک، داوێنیان، چەن‌کەس ئەی‌کێـشێ؛ قەت لـە ڕۆمـەتیـان، نانیـشێ مێـشێ؛
میللـەتـیش، چڵکـن؛ لـە ژیـان یاسـێ، بی‌خەیتە ئـاگر، بۆسـۆی هـەڵناسـێ.

—

ئەو ماڵە پاکەیش، وا ئـەوەڵ مـاڵ بـۆ، لـــە تارێکـــایێ مێـــژۆی ڕابـــردۆ،
دانریا بۆ خەڵک، بـە بـێ بـانو خـوار، ـ نەک وەک ماڵی‌تر، تایبەتێ زۆردارــ ،
زۆردار، ئەویشیان لە خەڵک سـەنـدەوە؛ بـــۆ ڕاوی مـــەردم، کردیانـــە ڕەوە.
پاشان، وەیـشۆمەی دەوران لـێ دابـۆ؛ لـە دەورو بـەریـا کـەسـێ نـەمـابۆ؛
کـــەلاوەیێـــک مـــاو، کۆنـــە دێـــواری، بوت، وەک بایەقوش، لە بانو خـواری؛
ابـراهیم، پـاکی کـردەو لـە پـەسـتێ؛ کردیـــەوە مـــاڵی یـــەکتاپـــەرەســـتێ،
تا خەڵک، بۆ یەکتر، سەر نـەخـەوێـنن؛ مـل، بـــۆ زۆرداران، دانـــەنـــەوێـــنن،
دێـسان خوێنتـاڵو دڵ هـەڵشـێوێنە. ماڵی خـەڵـک نیـە؛ خـەڵـک خڵـەتێنـە.
بـە خـشڵو زێنـەت دارو دێـواری، بە بوتی جۆر جۆر، لـە زۆرو خـواری،
دەری، دێـو جامـە؛ نـاوی، بـەرەڕەت، بـــۆ ڕاکێـــشانو گرتنـــی میللـــەت.
بـە زۆرە ملـێو، بـە لاتو مـەنـات، ژیـان لـە مـەردم، کـزو کـشو مـات.

—

ئەو شوێنانەیـش وا تـەمـەددون دارن؛ وەک ئێـرانو ڕۆم، کـۆکو تـەیـارن،
هەرچێ ئەبێنی، لـە ڕەنجـی خـەڵکـە؛ بەڵام بۆ تەنیا چەن کەس، بـە کـەڵکـە.
فاصـڵەی ژێنـی نـازدارو بـێنـاز، گەلێ زۆرتـرە، لـەجـێ وەک حیجـاز.

**جێگەی غەزەڵی ١: چەن باسی کوللی...**

بنــازم خوایــا! بــه ڕازی کــارت؛ به نه‌زمی سه‌یری پـڕێ لـه ئـه‌سـرارت!:
له خه‌ڵکی زه‌ردو سپیۆ سـۆرو ڕه‌ش، میلله‌تی حیجـاز، لـه زانـین بـێ‌بـه‌ش؛
له هه‌رلا، شوێنیێ[1]، لـه خوێنـده‌واریۆ، له په‌یغـه‌مبـه‌ران، مـابۆ بـه دیـاریۆ[2]؛
چ ئه‌وه، به ناو، پـه‌یـڕه‌وی دیـن بـۆن؛ چ ئـه‌وه، لـه دیـن، بێگانـه کـه‌فتـۆن.
تـه‌نانـه‌ت ئێـران: هێلانـه‌ی فـه‌سـاد، که له بیـر چۆبـۆ، باسـی عـه‌دڵ‌و داد،
هه‌زاران مێـرزا[3]و، خـوه‌نـه‌واری بـۆ؛ ـ ئه‌ڵبه‌ت، هه‌ر له ناو دۆ چینی ژۆرۆ ـ
بـه‌لام، حیجـازیۆ، لـه آثـاری دیـن، بۆیـان نـه‌مـابۆ، تـه‌نانـه‌ت نۆسـین!
یه‌کیه‌کیێ نه‌بیێ، «له‌ڕێ‌ده‌رچـۆ» بـۆن: لـه‌م‌لاو لـه‌ولاوه، چتـیێ فێـر بۆبـۆن.
میلله‌تێک هه‌مۆ، «امـّی»و نه‌خـوه‌ننـه؛ له خوا، بێگانـه‌و؛ بـۆ زاڵـم بـه‌ننـه.[4]
ئێتـر دیـاره، لـه بـاقیۆ آثـار تمـدّن، چـه‌نـیێ بـێ‌بـه‌شـه‌و نـه‌دار.
کزیۆ «تولید»یچ، هه‌ر لـه بـاس نـاییێ، چ لـه ده‌خـڵ‌و دان، تـا هـه‌ر کـالاییێ.
ئه‌وه‌یچـه کـه هـه‌س، زۆر بـڵاوو پـژ؛ فره‌ی ها به‌ده‌س جۆلـه‌کـه‌ی خـوێنمژ.
خێڵێک له‌و گه‌له، «قـریش»ن، کـه هـان له شاری مـه‌ککـه، مـه‌نزڵگـای وچـان:
کـاروانی هینـدو ئـه‌فریقـاو دۆرتـر، له‌ویێ، ئه‌یان‌خـست، مـانێ یـا ژۆرتـر.
که‌عبه‌یش ـ که بۆ خه‌ڵک، کرابوه یانـه، چاوکه‌ی ته‌وحید بۆ ـ بۆبـوه بـوتخانـه.
خه‌ڵک، له هه‌مۆلا، ڕۆیـان تـیێ ئـه‌کـرد؛ نـه‌زرو نیازیـان، بـۆ بوتـان ئـه‌بـرد.
بـه داوی بـوت‌و، ڕاوی تیجـاره‌ت؛ یا ته‌شقه‌ڵه‌و گـه‌ڕ؛ یـا شـه‌ڕو غـاره‌ت،
یه‌کیه‌کـیێ، ماڵیـان هـه‌بـۆ بـه لێـژاو؛ باقیۆ خه‌ڵک، هه‌ر وه‌ک خه‌ڵکی‌تر دامـاو.
خوایـا! وڵـاتیێ بـه‌م ئـه‌حواڵـه‌وه، بـه‌ژیـانێکی ڕه‌شـتر لـه شـه‌وه،

---

۱ـ شوێنیێ: اثری.

۲ـ توضیح در این‌باره، که: همیشه پیغمبران، پیشرو سواد و تمدّن، و بوجودآورندۀ آن بوده‌اند. و بعدها، گاهی، آثاری، از این دو نعمت، بدون باقی مواهب و مسائل دین، بجاهائی رفته؛ و یا تعالیم اساسی دین در جاهائی از بین رفته؛ ولی سواد و تمدّن صوری، باقی‌مانده؛ و یا اینکه حرکت تقدّمی را نیز شروع کرده است (پیش از رنسانس اروپا، و تأسیس مدارس جدید در ایران، معمولاً کار سوادآموزی، بعهدۀ افرادی بود، که علمای دینی، بحساب میآمدند).

۳ـ مێرزا، یا میرزا: که‌سێ که بتوانێ بنوسێ.

۴ ـ نبودن تمدن و رفاه.

ببێتـــە چاوکـــەی ئـــازادیۆ نـــۆر:    زەویٚ، ڕۆشـن کـا، سـنۆر تـا سـنۆر؟!

*

بە هەرحالٚ، جاریٚ، لەم باسـە لادەیـن؛    سەیری سەرهاتی سەیری مەککە کـەیـن:
ڕۆژیٚ لــە ڕۆژان، یــەکــیٚ لــەوانــە،    وا، نە لە خوار بۆن، نە لـەو سـەرانـە،
لە سەر ڕیٚو شوێنی جاهیلیٚ قـەدێـم،    کـە خـوا تێکـیدا، بـە دەس ابـراهیم،
نەزری کرد: ئەگەر کورم، بـۆن بـە دە،    دەهــەم، قوربـانیٚ بـوتو بوتکـەدە[1]
(ئـــاخر لـــەو ژێنـــی جـــاهلێتـــە،    کچ، مایەی عارەو؛ کـورٚ، بـەرەکـەتـە!)
عبـــدالمطلّب، هێـــوای هاتـــە دیٚ:    کورٚی، بۆن بە دە؛ زۆریان، کـەس نـەدیٚ.[2]
بەلاٚم دەهەمیان، بیٚوەی بـیٚ بـیٚوەی؛    هیچ نەکەی، سەیری قەدو بالاٚی کـەی!
لـە ئازایـەتـیٚو، لـە ڕاسـیٚو، پـاکیٚ،    لـە ئـەخلاقـی جـوان، تێـدا بـۆ پـاکی.
قەڵـەم، چـیٚ بڵـیٚ لـە باسـی جـوانیٚ؟!    بەڕاس، پیٚئەکەوت: «یوسفی ثـانـی»!
عبدالله! دەک دایـک، بـوٚت نـەکـا ڕۆڕۆ.    دەک چاوی چڵکن، بـە دۆر بـیٚ لـە تـوٚ.

---

عبـــدالمطلّب! بمـــرم بـــوٚ حاڵـــت؛    چ نـەزرێکـت کـرد؟! هـاوار بـە ماڵـت!
ئـاخر، دوشـمنیچ، دڵـی نـای، وەڵـلاٚ،    بڑاکنـــیٚ گـــوڵی گوٚنـــای عبـــدالله.
دێت: تـوٚ، چ نـەزریٚ نالـەبـارت کـرد؟!    دێت: چ بەلاٚیکـی بـە سـەرتـا هـاورد؟!

---

تانەت، لیٚ نادەم، پێـری خوێنـشێرێن!    دڵم، بوٚ دڵەکەت، کـولٚ ئـەدا لـە شـێن.
کـام دڵـڕەقـیٚ هـەس، کـە دڵـی بێنـیٚ:    عبـــدالله گیانـــت، خـــەمبـــار بـــوێنیٚ؟
پێره «جوانەلاو»، هەرکەس، ئـەیوێنـیٚ،    ئێژیٚ: هەک ڕۆڵە! خـوا[3] نـەتسـێنیٚ!

---

١ ـ مەسەلەی حەزرەت حمزه، کە هاوعومری حەزرەت محمـّد بوە؛ وە ئەگەر وابیٚ، بۆچکتر بوە لە عبدالله (پەس عبدالله ـ ئەگەر دەهەمیچ بیٚ ـ ئاخرین کوڕ نەبوە. وادیارە، ماڵی عبدالمطلّب، بەجاریٚ، شایانەی هەم حمزەو، هەم محمـّدی گرتبیٚ.

٢ ـ حدیث «بشارت با اولین نوزاد دختری».

٣ ـ توضیح دربارهٔ: دوگونه بودن حالت تلفظ بعضی کلمات کردی؛ مانند: «گیان»، «خوا»، «کوا؟»، «شوان» و...؛ که هم بصورت یک سیلاب رسا هستند؛ و هم بصورت یک کوتاه و یک رسا.

باوکیٚ، نەویٚتە «پەتپەتیٛ دەوران»، دڵی تیٚ: کوڕوا، لەدەس با ئاسان!؟

——

بەڵام، پیٛرە باوک، هەرچەن پەشیٚوە، خوێنی، لە دڵەو؛ باری، لە لیٚوە،
دڵپاکەو، خاوەن عەهدو پەیمانە. ئیٛمانی، قورسە، وەک ئەو کیٚوانە.
ئەگەر فەنبازگەل، بوتیان، بوٚ ڕاو بوٛ، ئەم، بە دڵیٚ پاک، بەرەو بوت ئەچوٛ.
ئاخر، ئەو چیٛ بکا؟ گەلیٚ دەورانە، باوی ولاٚتە بوتو، بوتخانە.
لە جیٚ ناسیٛنی خاوەنی هەستیٛ، بەرەو خوا ئەچن بە بوتپەرەستیٛ!
(یەکیەکیٚ، ڕوٚشن، یا «حنیف» هەبوٛ، لە خوا خوارتریان، لەلا، خوا نەبوٛ)

——

بە هەر حاڵ، گەیی وەختی پەیمانی: بوٚ «عُزّیو لاتو منات»[1]، قوربانیٛ.
شوٚڕەنەمامی سای گەردەن، مەڕمەڕ، گاوگردوٛن بکەن بوٚ بوتی بیٚفەڕ!
جوانیٛ عبدالله، بیٚ بە ساقەی لات! هەی لاتەی شەڕبەم لە لاتو مەنات!

*

(بەڵام، چوٛزانی، پیٛری دڵخەمیٛن! بەرنامەی خاوەن ئاسمانو زەویٛن؟)
(بەم گەلە گیٚلو نەخوەنەوارە؛ بەم شارە کانگای گەڕو، زوٚرداره)
(بەم نەزرە سەیرەو؛ بەم قوربانیە، خوا، کاری زوٚرەو؛ کەس ئاگا نیە.)

## جیٚگەی غەزەڵی ٢:

**ماجەرای قوربانیٛو، فەقیٛر کەوتنی عبدالمطّلبو ڕازی اسمعیلو عبداللهو، سەرئەنجامی قوربانیٛ!**

———————————————————

———————————————————

١ ـ توضیح دربارۀ اینکه: هرچند لات و منات و عزّی در مکّه نبودند، با اینحال، کعبه، مرکزیّت داشت؛ و غالب مراسم مربوط به آنها، در آنجا، انجام می‌شد.

لە ڕازت، خوایا! کەس سەر دەر ناکا.　　　داخۆم چەن ئەسرار هەبێ لەم خاکا؟

کێ بۆ بزانێ: چیە، بە شەوێ،　　　عبدالمطّلب، فەقێر ئەکەوێ؟

———

لە گەورەماڵی خێڵەکەی هاشم،　　　ماڵێک، ماوە،[1] ڕۆت، بە بێ سمو دم.

بەر لەم پێشاتە، ماڵە گەورە بۆ،　　　هەرچەن لە ڕێزی تەواو بان نەبۆ.

بەڵام ئێستاکە، ماڵێ ڕەقو تەق،　　　ماوەو[2]؛ ژیانێ تەواو تەقو لەق.

بێدەقو مێزان، بە بێ خزمەتکار.　　　بێچزەو بزە، بۆ شامو نەهار.

بێ قوڕەی گاگەل، قاڕەی مەڕو ماڵ.　　　بێ حێنەی ئەسپی کوێتو تاڵو ئاڵ.

ئەمما هێشتا گشت، بەبێ پەرۆشن؛　　　بەم وەزعە تازە، یەکجار دڵخۆشن.

چۆنکە: ئەر ماڵیان، وا، لە دەس داوە،　　　شۆڕە جوانێ وەک عبدالله ماوە.

«با ماڵی دنیا، بچێ بە تالان؛　　　جوانی وا، خۆش بێ، بۆ ناو هەوالان»[3]

با، با، بێ بیبا؛ ماڵ چیەو مەنزڵ؟　　　جوانێ وا خوەش بێ، بۆ سوکنایێ دڵ.

**

پاش چەنای چەن ساڵ، دێسان، عامالفیل،　　　پێش هات، بە سەرهات حضرت اسمعیل:

لە ئەولادەی ئەو، باوکێ، هەمێسان،　　　کەوتە ڕێ، ڕۆڵەی، بکاتە قوربان.[4]

ئەمجارەیچ، شێویا، بە ئەمری یەزدان:　　　«هەروا، لە خوڕا، قوربانێ انسان!».

—

(تا ئاخری، کەی، یا لە چ شوێنێ،　　　ئەم بنەماڵە، شەرتی بنوێنێ؟)

(بە قوربانییێک، جوانتر لە حەیات:　　　سەرمەشقی خەبات، بۆ خەڵکێ دابات!)

(ڕێگەی «چۆنمردن»، نیشان باتە خەڵک؛　　　نەک سەر بڕیانێ فێرۆو بێکەڵک!)

(یا بە فەرمۆدەی «صوفێ خوێنشێرێن!»،　　　عارفی گەورەی سەرمەستی ئەوێن،)

---

١ ـ بمعنی «باقی ماند» نه بمعنی «مانده است».

٢ ـ برعکس بالائی.

٣ ـ تضمین با تغییر.

٤ ـ بمعنی قربانی کردن است.

(سەرمەشقێک، وەها، «جەعەیب بەرێ بوٚ»،     لایق بوٚ، وەصفش، بە «عظـیم» کریـوٚ!)

———

وەختێ، عبداللە، بـە سـلامەت دەرچـوٚ،     مەککە، لە شـادێو شـوکرانە، پـڕ بـوٚ.
نـــەخــــوازەلاّ، دلْ ئـــەو کچانـــە، وا،     دلّـــی بردبـــوٚن، عیـــشقی عبـــداللە.
ئەنجا، هەر باوکێ، بە خـوٚی ئـەنـازێ؛     بـە جـوانێ و ژێـرێ کچـی ئـەنـازێ،
بە «شـێرێک، لـەملا؛ ڕێویێـک، لـەولا»،     لـــە زەمـــاوەن، ســـەرباســـی داهێنـــا.
سەرت نەیشێنم، زوٚرێ باسـیان کـرد؛     لایق عبـداللە، کـەسـیان شـک نـەبـرد.
ئاخری، هەرچێ، «سەریان هێناو بـرد»،     هەرچێ، ڕاوێژو سێو دوٚی دلّیـان کـرد،
هومای خوٚشبەختـێ، گـەڕا لـە هـەرلا،     تا، لە سـەر مـالّی «وهـب»ەوە، دای دا:
آمنـــەی کچـــی وەهبـــی، کـــردە چـــاو.     باوکو کچـێ کـز؛ وەلێکـان خوٚشـناو.
هەر دوٚمالّ، هەرچـێ بێریـان کـردەوە،     هاومالّی یەک بوٚن، لـە هـەر سـەرەوە.
مـانْی سـەربـەرزێ آمنـە، هـەلْهـات؛     باقێ کێـژان، دلْ پـڕ خـەم، کـزو مـات.
زەمـاوەن کریـا، ڕبـّی! پێـروٚز بـێ.     بەختی تـازەمـالّ، بـە دلْ دلّـسوٚز بـێ.
مالّ، گشتی، دلّخوٚش. بەلاّم، داخـەکـەم،     یەکجار دەستەنْەو، ڕوٚتو، هاوسەرکـەم.
چەن مانْ گـوزەرا؛ ڕاسـی، ئـەپرسـێ،     خاو خێزان، هەمـوٚ، ڕوٚتو، زکبرسـێ!
تـــازە مالّـــەکـــەی وەوێو زەمـــا،     «سێـسرک، تیـا، موناجـات ئـەکـا!»
هەرچەن گەورەمالّ، خـەجالّـەتبـارە،     کـە بـوٚ زاواو بـوٚک، زوٚر ناتـەیـارە؛
بـــەلاّم هێـــشتا مـــالّ، پلـــەزێقانـــە؛     لـــە شـــادێ، دلّـــی هـــەمـــوٚ، لێوانـــە:
شـوکور، کـە زاواو بـوٚکی تـازەمـالّ،     زوٚ بـە زوٚ ئـەبـن بـە خـاوەن منـالّ!
زوٚرتـر، آمنــە و عبــداللە، دلّخــوەش،     بەمزوٚ، ڕوٚلّـەیـان، ئـەگرنـە بـاوەش!

## غەزەلّی ٣: دلّخوەشی...؛ وە مەرگی عبداللە:

گـەورەو بچـوٚکی خـاو خێزانـی مـالّ،     بـەم مزگانیـە، دلّخوٚشـو خوٚشـحالّ؛
کە: خوٚشەوێـسیان، عبـداللەی بـەڕێـز،     زوٚبەزوٚ، ڕوٚلّـەی، ئـەگـرێ لـە ئـامێز!

چ خەم گەر کەوتۆن وەسەر زەوێ ڕۆت؟ — بۆ بەختی تازە، ئەخەن تاق‌و جۆت.
ئەم ئێژێ: ڕۆژی تاڵەی بەتێنە. — ئەو ئێژێ: کوڕێ کاکۆڵ زەڕێنە.
ئەمتر: هەسارەی بەختی، ڕۆناکە. — ئەوتر: بۆ ڕۆڵەی عبدالله چاکە.
چەن بە ڕزگار بۆن عبدالله شاد بۆن، — ئەم باسە، زۆرتر، دڵی کردن ڕۆن.
تازە شەوق‌و زەوق کەوتبوە ناو ماڵ، — مەرگی ناخلاف، ژێنی کردن تاڵ:
پەیکی ئەنجەڵ هات، عبداللەی ڕفان — ماڵی کەیفخۆشی، لە خێزان ڕمان.
هەمۆ هەڵیاندا بانگی شێن‌و ڕۆ — ئەم مردنە نای بە دڵ گشتا، سۆ.
یەکجار ڕۆڵەڕۆی باوکی دڵسۆتاو؛ — عبدالمطّلب، کۆسکەوتۆی داماو:
کاتێ کە ڕۆڵەی، ئەلاوانەوە، — دڵی کوچکی، ئەتاوانەوە:
ئای، عبدالله گیان! هێوای بەتێنم! — تازە بەهاری پاییزی ژێنم!
بۆ تۆم لە دەس دا، دارو نەدارم، — جارێ گلەییێک نەهاتە زارم؛
ئەموت: عبداللەم بۆ خۆش بێ. بە تۆن، — لە خۆشی‌و تاڵی، لە بۆن‌و نەبۆن.
چەن دڵی ماندۆم، پڕ ئەبۆ لە هێز: — تۆ صۆزێ ڕۆڵەت ئەگری لە ئامێز.
ڕۆڵە! بە قوربان خۆت‌و ڕۆڵەت بم؛ — قوربانی هێوای دیدەو نەدیەت بم؛
لە دوای بالای تۆی وەک تەرزی چنۆر، — منی لاکەوتەی وەک کوڵەی تەنۆر،
ڕۆڵەی نازارت، چلۆن بەخێو کەم؟ — خەمی هەتێوێ، چۆن لە دڵ کەم کەم؟
سەرانسەری شار، پڕ بۆ لە ڕۆڕۆ. — تەمی خەم، جەم بۆ لە دلان کۆکۆ.
مەرگی عبدالله، هەمۆی خەمبار کرد. — شاری، پڕ گریان، پڕ لە هاوار کرد.

(کۆتایی غەزەلی ٣)

چەن مان لە مەرگی عبدالله، لای‌دا؛ — هوما، لەسەر ماڵ ئازیەتبار، دای دا!:
شوکور ڕۆڵەکەی عبدالله، کوڕە! — کوڕێکی وریاو، ساق‌و، بەگوڕە!
جوانەمەرگەکە، داخی، سارێش بۆ. — پەژارەو خەفەت، لە دڵگەل، دەرچۆ.
شادێ کەوتە ماڵ؛ نایان شایانە. — هاتنە کوڕانە، یانە وە یانە.
ـ هەر چەن ماڵەکە، بۆ مێوان، پەس بۆ؛ — بەلام، ڕۆخوەشێ خاوەن ماڵ، بەس بۆ ـ.

ئەنجا باسی‌تر، هەمۆ بۆن بەتاڵ.   باس، بۆ بە باسی ناونانی مناڵ.
وە ڕاوێژ کەوتن، لە دوروشتو ورد؛   هەرکەس، ناوێکی، پێشنهاد ئەکرد.
هەرچێکیان ئەوت، ناوی تازەو زۆ،   عبدالمطلّب، بە دڵی نەبۆ!
هێچ[1] نەما ناوی شاریٚ و عێلاتیٚ؛   ئەو، هەر دۆدڵ بۆ قیافەی ماتی!
هەمۆ سەرسام بۆن: بۆ بە هیچ لایێ،   عبدالمطلّب، سوکنایی نایێ!؟
چاویان بڕێبۆ، گشت، لە ناو چاوی:   بۆ بە هیچ ناوێ، دڵنیا ناوی!؟
جوابێکی نەبۆ، بێژگە «نازانم».   ئەی‌وت: بە ڕاسیٚ، خوەیچم، حەیرانم!
گشت ئەهلی مەجلیس، کەوتن کش‌و مات.   ئێتر، نۆکەیێ، لە کەسەو ناهات.
کوتۆپڕ، سیمای دۆدڵیٚ، گۆڕاو؛   لێویا بە دڵیا، ناوی نەبێسراو.
وا، دڵ قایم بۆ، کەس نەی‌دێبۆ قەد؛   وتی: وا، ناوم، نایە «محمّد».
زۆریان پێ سەیر بۆ؛ تۆڕەو، لەسەر خۆ،   هەمۆ، ڕۆی دەمیان تێ کرد: ئاخر، بۆ؟
بەڵێ، بە مەعنا، زۆر جوانە؛ بەڵام،   نەبوە، ناوی وا، لە یەمەن تا شام!
جوابی، دانەوە: وام بە دڵا هات،   ئەم کوڕە ناوی بە چاکە، داخات.

## جێگەی غەزەڵی ٤: ڕوداوەکانی شەوو ساڵی پیرۆزی لە دایک بۆن

———————————————————————

———————————————————————

عومری محمّد، گەییە دۆ سێ ساڵ،   زوانی پاکەو کرد، کەوت لە گڕۆگاڵ.
کەوتە قسەو باس، زەینی، کراوە.   بۆی دەرکەوت: باوکی، زۆ، لەدەس داوە.
جارجار، مات ئەبۆ، بێر ئەی‌بردەوە:   لە هەتێوی خۆی، بیری ئەکردەوە[2]!
لەبەر خۆیەوە ئەی‌وت: ئاخ بریا،   باوکم نەچوایە، وا زۆ لە دنیا!

١ ـ هیچ ـ هێچ.
٢ ـ بیریە کردەوە.

خوزگا ئەمزانی، بزەی باوک، چۆنە! تۆڕەیێ چلۆن! نازی چلۆنە!

جارجاریچ ئەی‌وت: ئاخ، توخوا دایە! چەن خۆش بۆ، جارێک، باوکم بدیایە!

توخوا، دایە گیان! بۆچێ ئاوا زۆ، بابە گیانەکەم، جوانەمەرگە بۆ؟

دایە، بەر ئەبۆ گرێ، لە هەناوی. لێ ئەشاردەوە فرمیسکی چاوی.

ئەی‌وت: ڕۆڵە گیان! بەنەنی گیانم! منیش هەر وەک تۆ، هیچێ نازانم.

ڕازی هەتێوێت، نازانم چیە. حەتمەن، کاری خوا، بێحیکمەت نیە.

---

خەمی بێباوکێ، هەرچەن گران بۆ؛ سەرباشقەی هەمۆ خەمو دەردان بۆ،

بەڵام مەحەببەت دایەلەی ژێری، دەری ئەکرد ئەو داخە لە بێری.

## جێگەی غەزەڵی ٥: مەرگی آمنە

---------------------------------------------

---------------------------------------------

مناڵی هەمۆ دەوڵەمەن تا شوان، هەر، کەسێکیان بۆ، بۆیان بێنێ نان.

خەرێک کایە بۆن لە کۆجێو کۆلان. تێر بۆن لە کایە، ئەنجا بۆ وچان.

یا بلاو ئەبۆن بۆ ژەمەن خواردن؛ یا بە شەوچەرە، شەو ڕابواردن.

یا کۆ ئەبۆنەو بۆ موشاعەرە: کێ شیعری جوانی، زۆرتر لە بەرە؟

ـ چۆنکە میللەتێ نەخوەنەوار بن، بەرەو لای شیعرو قسەی جوان ئەچن.

هەر وەک بەیتو باو، بالۆرەو حەیران، شمشاڵو بلوێر، بە هەوای جوان جوان[1]،

لە فرە شوێنا لە کوردەوارێ، کە بێبەش مابۆن لە خوێندەوارێ[2].

حەیفی، ئێسە وا، کەوتوە باری، کە وەختە ببڕێ شوێنو ئاساری. ـ[3]

١ ـ تکرار، برای کثرت است.

٢ ـ توضیح فرق دو «وارێ».

٣ ـ توضیح مسأله، در حجاز و کردستان.

به هەر حاڵ، هەمۆ منداڵی ناو شار، لە ڕۆژو هەژار، تا دێواخاندار،
کەسێکیان هەبۆ نازیان بکێشێ؛ بێتە دەمیانەو، بۆ دەردو ئێشێ.
محمد نەبێ؛ بێکەسو بێ‌ناز! لە دەرو، لە ماڵ، تەنیاو بێ هاوڕاز!
خەڵکێ، دنیا بێ، لە حەسێویانا، بزەیێک بەلاش، نایتە لێویانا!
جۆڵەو، نۆکەیان، هەر بۆ دنیایە؛ چاوە چاویانە: چێ بێتە کایە؟!
بۆ منداڵ خوەیچیان، به حەساو سۆزێ، که خزمەتیان کا، ئەکەن دڵسۆزی!
دنیادۆس، دڵی، بۆ کەس ناناڵێ. مەگەر بە حەساو هێزێ، یا ماڵێ!
قەت لە بەزەیێ، هیچ ناکاو، ناڵێ. گەر جارێکیچ با نازی مناڵێ،
لە بنەو، چاوی، لە کەس و کارە! دڵی، لەلای ماڵ، یا کارو بارە!

——

دەی خۆ محمد، هەتێوەو بێکەس؛ لەجێ هەمۆ کەس، باپیرێکی هەس،
ئەویچ بڕیاگە هێز لە دەسو پای؛ ئەبێ محمد، بگاتە فریای!
زۆتریش تەواو ماڵو مێزانی، لەڕێ نەزرەکەی، بۆ بە قوربانێ:
بۆ پاسای خوێنی ڕۆڵەی نازاری، دوڕاندی هەمۆ دارو نەداری.
ناچار، محمد، هەر بە منداڵێ، هەر لە تەمەنی پێنجو شەش ساڵێ،
کەوتە سەر شانی، باری ئەسیرێ، بۆ داژیاری خۆیو باپیری.
پێ‌خاوس، ماندۆ، بە شاخانەوە، لە تەک بەرغەلاو، بە شوێن ڕانەوە.
کاتێکیش لە کێو، بۆ ماڵ بێتەوە، خوا خوایە تاوێ بحەسێتەوە.
لە بێری ئەچێتەو دڕک دەسو پای؛ مانیەتیش هەیە، لە باتی لای‌لای!
ئاوا، سەختە بۆ محمد، ژیان؛ ئێتر ئەو لە کوێو، کایەو هەڵتێقان!

——

سەرەڕای هەمۆ ڕەنج و فەقیرێ، دڵخۆشە بە ڕۆی خۆشی باپیری.
وەختێ، باپیری، لە باوەشی ئەکرد، هەمۆ خەمێکی، لە دڵ دەر ئەکرد.

## غەزەڵی٦: کۆچی دوایی عبدالمطلب:

محمەدّ، بێبەش لە هەمۆ نازێ؛ کەسێکی نیە، بۆی بێژێ ڕازێ[1].
باپیرێک پیرو فەقیر، شک ئەبا، زامی هەتیوێ دڵی، سارێش کا.
دڵی چکۆڵەی، بە ئەو، قەوێ بۆ؛ هەمۆ تەمێکی، لە دڵ، ڕەوێ بۆ.
ڕۆژێکا، ماندۆ، هاتەوە بۆ ماڵ؛ دەسو پای وردی پڕ لە دڕکو داڵ؛
یەکڕاس، هەڕای کرد، بەرەو لای باوا، دەس کاتە ملی، مانیەتێ لاوا.
لە باتێ بزەو پێشوازی باپیر؛ «ئۆخەی»و «ڕۆڵە»ی پڕنازی باپیر،
لە دۆر، دەنگی شین، دڵی کرد بێتین. چون، باش ئەیزانی مەعنای دەنگی شین!
چەن منال، بەرەو پیرێ، ڕایان کرد؛ وتیان: «محمەدّ! خۆ باپیرت مرد!»!

*

دەردی محمەدّ، دیسان دیویاوە. زامی کۆنەو نۆ، هەمۆ کولیاوە.
ماڵ، چۆڵ و هۆڵ کەوت، تەم لێ ئەباری: نە باوک، نە دایکێ، نە کەس و کاری.
محمەدّ، ماوەو[2]؛ ماڵی کشو مات. لە دڵیا نەما ترۆسکەی ئاوات.
باری پەژارە، لە جێ بزەی لێو. خەم، لەسەر دڵی، بە بارسایێ کێو.
ئەمجار، حاڵێ بۆ، دەردی هەتیمێ. کولیاوە ناسۆر زامی قەدیمی.
منالێک ماوە، بە تاقی تەنیا؛ کەسێک شک نابا، لە تەواو دنیا.
کەوتە بیری ئەو ئاواتە کۆنە: ئاخ بیزانیایە: بزەی باوک، چۆنە!
(ئاخر، ئەو هێشتا، دنیای نەدیبۆ، باوکی بە دەردی جوانەمەرگێ، چۆ.)
کەوتەوە بیری: منالێک بۆ، ورد، ئامینەی دایکی، لە باوەشی ئەکرد:
ئەیخوا، چەن خۆش بۆ، ساقە بۆنەکەی! یا جار جارێکیش بە گڕا چۆنەکەی!
ئەگەر دڕکێ، بچوایتە پایا؛ یا بڕۆکیایە دەسی، لە کایا،
ڕەنگی، ئەپەڕی. ڕای ئەکرد بۆ لای؛ صەد جار، خوەی ئەکرد بە قوربان بالای!

---

١ – حکایت.

٢ ـ به معنی «باقی ماند»، نه «مانده است». تفاوت در تکیه (آکساند) است.

ئەیگرتە باوەش، بە صەد نازەوە؛ — بە دواندنو، بە دەم ڕازەوە،
ئەگەر درێک بۆ، دەری ئەهاورد؛ — ئەگەر برێن بۆ، دەرمانی ئەکرد.

——

منالٚ باوش بۆ، دایکی، لێ سنیا؛ — ئەویش، جوانەمەرگ، دەرچۆ لە دنیا.
ئەوا، باوایچی، ڕۆیی؛ ئەم ماوە. — چرای ئومێدی، تەواو کوژیاوە!
دڵی بۆچکەلەی، کوڵیاو، هاتە بان؛ — ڕژا فرمیسکی، وەک ڕێژنەی باران.
چاوی، هەڵبڕی، بە ئەسرێنەوە؛ — بە بەرەنسکەی گەرمەشێنەوە:
ئەیخوا! ئەی خاوەن زەوێن و ئاسمانٚ! — خاوەن شەوو ڕۆژ! خاوەن خوەرو مانٚ!
ئەی خوا! ئەی خاوەن گیاندارو بێگیان! — خۆ، بە دەس تۆیە مردنو ژیان.
داخۆم، بۆ ئەونەم، خەم بۆ ئەنێری؟ — ئەم گشت مەینەتەم، بە سەراتێری؟:
ڕۆشنێ دنیام، بە چاو نەدیبۆ، — بابەی عەزێزم، جوانە مەرگە بۆ.
لەبەر هەتێوێو، دەردی بێ نانێ، — هەر کەوتمە سەر پێ، کەوتمە سەپانێ.
ئەو گشتە داخەی، لێ ئەکردم کەم، — نازو نەوازش دایە گیانەکەم.
چەن زۆ، ئەویچت لێ سەندم، خوایە! — بێبەشت کردم لە باوش دایە!
ئەی خوا! هەر تەنیا باواییکم بۆ، — سارێشی ئەکرد، زامی تازەو زۆ،
ئەوا، ئەویچم، ئاوا، دا لە دەس! — ئەی خوا! ئێتر من، بێکەسم، بێکەس!
خوایا! ناشکورێ ناکەم؛ بم بەخشە. — ئەزانم: کارت، بێعەیبەو لەخشە.
من، چەم، لە مولکی پەڕ نادیارت، — کە سەر دەربێرم لە ڕاز کارت!؟
دایکم، ڕاسی ئەوت ـ بە ڕەحمەت خوابێ ـ: — حەتمەن، کاری تۆ، بێحیکمەت نابێ.

(کۆتایی غەزەلی ۴)

لە سەرەمەرگا، عبدالمطّلب، — تکاو لالەی کرد لە ابوطالب:
ڕۆڵەم! وا، ئەجەلٚ، هاتە پێرایێم. — وا، لەسەر ڕێگەی کۆچی دوایێم.
پاش من، محمّد، تەنیا ئەمێنێ؛ — بێکەسو بێدەر، بێ خەمڕەوێنێ.
نە دایکو نە باوک، نە خوشک، نە برا. — تەنیا کەوتوە، وەک بەرخی تەرا!

سەرچاوکەی خێڵی، بێ ئاوی ئاوات، / بە مەرگم، یەکجار، وشکایێ داهات!
دەخێل! برازا سفتە جەرگەکەت، / یادگار برا جوانە مەرگەکەت،
تەواوی عومری هەشتو نۆ ساڵەی، / هەر کۆس کەوتن بۆ[1] داخی پەیدەرپەی.
دەستەنێ منێچ، سەرەڕای ئەوە، / هەر نەیهێشت ڕۆژێ، بحەسێتەوە.
ڕۆژێکی نەدێ، بە وچانەوە؛ / دایمە تەقڵەو دەو[2] بە کێوانەوە.
ئاخ، ڕۆڵە! هەرچەن دڵی سۆتاوی؛ / بەم منالیە، گۆنای ژاکاوی،
تێتەوە بێرم، دڵم وە کوڵ دێ؛ / وەختە، یەکجارێ، گڕم تێ بەر بێ!

---

عبدالمطلّب، بە گریانەوە، / دەردەدڵی خۆی، ئەگەڕانەوە.
لە پڕ کوڵی دڵ، وا زۆری هاورد، / اختیار قسەی لە دەسی دەر کرد.
وەک مردۆ مردۆی تازە کۆسکەوتۆ، / تون، بانێ هەڵداو، دەنێ بەرزەو بۆ:
ئاخ محمّد گیان! ڕۆڵەی هەژارم! / عەزێزی بێناز کەوتۆی نازارم!
ڕۆڵە! بمرم بۆ دڵی خەمبارت؛ / بۆ ژینێ تاڵی وەک کەکرەی مارت.
ڕۆڵەی تاقانەی ڕۆڵە جوانەکەم! / ئاواتی دڵی عەبە گیانەکەم!
ڕۆڵەی دایکو باوک بە جوانێ مردۆ! / هەر بە منالێ، بە مەینەت پێر بۆ!
ئاخ ڕۆڵە! یاخوا کوێرایێم دابێ، / وا نەمتوانی بۆت ببم بە بابێ.
پێرێ نەیهێشتم هەولێکت بۆ بەم. / نەمتوانی نانێ وشکێت بۆ جۆر کەم.
ڕۆڵە گیان! وەختێ کە ناوتم ئەنیا، / پێم وابۆ: تۆ تاق ئەبی لەم دنیا.
تاق، لە گەورەییێو، احترامدارێ؛ / نەک، لە فەقێرێو، بێکەسو کارێ!
وام بە دڵا هات: زۆر ناودار ئەبی؛ / ناهات بە دڵما: وا هەژار ئەبی!

*

ئاخ محمّد گیان! بە گیانت قەسەم، / باپێرت، گڕی بەردا لە جەسەم.

---

۱ – توضیح دربارهٔ سقوط «واو» عطف و «یاء» اضافه در کردی.

۲ – توضیح معنی حقیقی و مجازی.

بۆ ژینی تاڵت، تاقه گوڵه‌که‌م! منیش، گڕی سه‌ند کۆره‌ی دڵه‌که‌م.
محمّد! قوربان داخی دڵت بم، دڵی بچکۆڵه‌ی پڕ له کوڵت بم.
قوربان مناڵێ پڕ ڕه‌نج و تاڵت! قوربان ده‌س و پای پڕ درکو داڵت!
په‌رده‌ی چه‌م، پێنه‌ی سێپاڵی شڕت. سه‌رم به سه‌رگه‌رد دڵی پڕ گڕت.
دڵم، به‌رده‌باز پا بێ پالأکه‌ت. گیانم به فدای قه‌دو بالأکه‌ت.

——

ئاخ محمّد گیان! توخوا مه‌گره لێم. خه‌جاڵه‌تبار خۆم، بۆ قسه‌ی بێجێم!
ـ هه‌رچه‌ن، زۆر زانا، پێم بلێن نه‌زان ـ من، به بانه‌واز ئێژم: ئاغه گیان!
من، که‌ی قابلم، به فدای خۆت بم؟ به قوربان باوای دڵ پڕ له سۆت بم.
به قوربان باوکو دایکی ناکامت[1]. به قوربان ابوطالبی مامت.
قوربان ئه‌وه بم، دڵی بۆت تێری: به دڵ، خزمه‌تت، به جێگه بێری.
دڵی، بۆ دڵت، به دڵ، ژانی بێ، هه‌زار جار دڵم، به قوربانی بێ.
کێ، گڕی حبت، به‌ربێته گیانی، ڕۆح و گیانه‌که‌م، به‌لأگه‌ردانی.

*

باپێری کوڵوڵ، به ده‌م مه‌رگه‌وه، به کوڵی دڵو، کڵپه‌ی جه‌رگه‌وه،
گڕی هه‌ناوی، وا ئه‌هاته بان، دڵی بێبه‌زه‌ی یزیدی ئه‌سۆتان!
وه‌ها عبدالله‌ی، ئه‌لاوانه‌وه، دڵ دارو به‌ردی، ئه‌تاوانه‌وه:
ڕۆڵه‌م، عبدالله! جوانه مه‌رگه‌که‌م! به‌نه‌نی دڵم! گێری جه‌رگه‌که‌م!
گوڵی تاقانه‌ی سه‌رانسه‌ر حیجاز! به‌رامبه‌ر جوانێت، گوڵی ناز، بێناز!
وه‌ک باره شارم بێته‌وه، هه‌مۆ دار و نه‌دارم، بۆ تۆ، له ده‌س چۆ!
وا، دڵم هه‌ڵکه‌ند له مه‌ڕو ماڵم، چشم کرد له نان خێزانی ماڵم.
که‌وتمه بان زه‌وێ ڕۆت و؛ نه‌موت وه‌ی! له خوه‌شێ بالأت، هه‌ر ئه‌موت ئۆخه‌ی!
تۆیچ، وا، هه‌ساره‌ی جوانێت هه‌ڵکه‌نیا، تاقانه‌که‌ت ما، بێنازو ته‌نیا!

———

١ ـ توضیح مسألة فترى بودن.

بـــاوا، پـــاش بـــەینـــیٚ نـــالاٚنو رِوٚرِوٚ،    نـــەختـــاڵیٚ، حـــاڵی، هاتـــەوە ســـەرخـــوٚ.
جا، وەختیٚ، دڵی، کەوت لە کـەفو کـوڵ،    چکـــــیٚ دامرکـــــا گڵپـــــەو گـــــرِی دڵ،
ئەنجـا رِوٚی کـردە کـورِە خاسـەکـەی؛    دیٚسان چـوەوە بـوٚ سـەر باسـەکـەی:
دەســـمە داویٚنـــت، رِوٚڵـــە گیانـــەکـــەم!    بـــە دڵ، ئاگـــات بـــیٚ لـــە تاقانـــەکـــەم.
ئیٚتر ئـەم ماڵـە، بـیٚخـاوەنـەو، چـوٚڵ.    چـوٚن تیـا هـەڵ کـا منـاڵیٚ کوڵـوٚڵ؟!
ئـەزانـم: خـوٚ تـوٚیچ، تـەواو نـەداری.    سـەرەرِای ئـەوەش، زوٚر خیٚزانبـاری.
هێوامـــە: نـــەیڵـــی بیٚکـــەس بمیٚنـــیٚ.    ئیٚتر ئەویچ خوەی، نان خـوەی دەردیٚنـیٚ.

---

بەرِاس، پیٚرە[1] مام؛ باوکیٚ دڵسوٚز بـوٚ؛    هەرچەن بە سەروەت، جیٚماوی هوٚز بوٚ.
جـیٚ بـاوکو بـاوای، بـوٚ پـرِ کـردەوە.    داخـــی هـــەتیٚـــویٚ، لـــە بیٚـــر بـــردەوە.

---

بـــەلاٚم محمـــــّد، هـــەر بـــیٚوچانـــە:    یـــا لـــە رِەنجبـــەریٚ؛ یـــا لـــە کیٚوانـــە.
نەک نان؛ بـوٚ بـژیٚو مـەمـریٚ تـەنیـا،    هـــەر حـــەســـانەوەی، نیـــە لـــەم دنیـــا.

## جیٚگەی غەزەڵی 7:

### سەر خوٚشی بە ستایشی محمــّد ـ دەس گرتنی محمّدو یارمەتی‌دانیشی بە ابوطالب

---

---

«یەکیٚ» بوٚ؛ یەکیٚ نـەبـوٚ. لـە خـواوەن    گەورەتر، کـەسـیٚ نـەبـوٚ، کـە پـاوەن
بکاتـــەو لـــە پـــای بـــەختـــی هـــەژاران؛    دەرمـــان کـــا، دەردیٚ، لـــە دەردەداران.

---

1 ـ «پیره» با دو معنی.

مکّە! چەن ساڵە، هەر باسی سەیرە، ئەبیەی! ئیشەڵڵا، ئاخرت خەیرە!
داخۆم خاوەنی بەرزیٚو نشێویٚ، لە کارخانەی غەیب، چیٚ بۆ نۆسێوی!
لەوساوە کە خوا، بن دنیای ناوە، چاوت بۆ لافاو، لە چاوە چاوە.
لە شێوو دوڵت، هەر نەبۆ تاوێ، دەنٛ بداتەوە، هاژەی لافاوێ.
هەرگیز هەڵ نەکەوت، کۆسارت بێژێ: ئۆخەی! هات دەنٛی تافێ، لە لێژێ.
ئیمساڵ، لافاوێ، کەوتە ڕێ، بێشۆ؛ زەنەقیان تۆقی، دۆڵ و ساراو، کۆ!
لافاو، چ لافاو! مەڵێ لافاوە! بەحرەو؛ لەسەر شار، لێژەو دراوە!
بەڕاس ئازێزان! لافاوی ئیمساڵ، مەککە، نەیدیبۆ، حەتتا بە خەیاڵ!
بەڵێ؛ جارجارێ، تاوە بارانێ، لە چۆڵگەی حیجاز، یا لە شارانێ،
ئەبارێ؛ بەڵام، وەک ئەم لاسامە، مەککە، نەیدێوە، بەم زۆرو سامە!
لافاو ئەوانە، جۆگەلە ئاون! لای ئەم لافاوە، بەچکە لافاون!
چەن ماڵی، هەڵکەند؛ تاشی، داماڵی. چەن قەڵای قورسو سەختی ڕاماڵی.
چەن کۆشکی پایە لە ناو تاشانا، کە لافاو داچۆ بە ڕێشەیانا[1].
کەعبەیچ، وا، لافاو هاتو دایپیا، کەلاوەیێکیچ نەما لە جیا!
لە مێچو پاسار، لە دارو دێوار، «حجرالاسود»،[2] بە ساق ماو، قوتار.
قورەیش، بەجارێ، دڵیان داتەمیا، کە: ماڵی دێنو دنیایان[3] ڕمیا!
کەس نیە، بە ڕەنٛ زەردەخەنەوە: کەعبە ڕۆخاوە؛ چۆن بێکەنەوە؟
ئاخر، وڵاتیان، زۆر بەجێ مابۆ؛ هەمۆ کاڵایکی، لە دۆر، بۆ ئەچۆ.
نەخوازەڵا، چێ، چکێ لەبار بێ؛ بۆ کاری گەورەو گران[4]، بەکار بێ.
صەددەق لە کارت! خاوەن خوارو ژۆر! چ دەنٛو باسە، لەلای بەحری سۆر!؟

---

١ ـ هم به معنی حقیقی، و هم مجازی.

٢ ـ راز حجرالاسود؟

٣ ـ قبلاً توضیح داده شده.

۴ ـ له هەر وڵاتێکا، نەوعە کارێ، لەبەرچاوی خەڵک، گەورەو گرانە، کە امکاناتی، ناجۆر بی. لە حیجازا، مصاڵحی بنای وەک کەعبە، دەس ناکەوت.

لــەو دۆر دۆرانــە: پاتــەختــی یــەمــەن،
خەرێکن کۆشکێ بێوێنــە ســاز کــەن.

کەشتی ییێکیان نــارد، بــە زلــێ کێــوێ،
هـــەزاران فرســـەق ڕێگـــە بپێـــوێ؛

بــارێ هــەڵگــرێ، کــەرەســەی خــانۆ،
لــە مــصرەوە بــۆ قــولزومی خــوارۆ.

تا ئێــسە کــەســێ، چــت وای نــەدیــوە:
لەم پــالا، کــەشــتێ، لــەقــورێ چــەقێــوە!

ئەویچ لــە شــوێنێ نزیــک بــەم نــاوە،
کــە تــازە مــاڵی کــەعبــەی، ڕۆخــاوە!

ئەمجار، گــەمیێــک، وا، بــەختــانی بــێ،
کـــە بـــاری، کـــالای ســـاختمانێ بـــێ!

———

قورەیش، لەم ڕازە، کــە ئاگــادار بــۆن،
بە هەڵــەو داوان، بــەرەو دەریــا چــۆن.

ئاغەگەل قورەیــش، مامــەڵــەیــان کــرد؛
پۆڵیان داو، کالای گەمیــەکــەیــان بــرد.

———

پلـــەزێقانـــە، لـــە مـــەکّکـــە: ئـــەوە،
بـــاری مـــەســـالّح، گـــەییـــە بـــەرەوە!

وەستاکار جەم بۆن؛ دەسیان کردە کــار.
بنـــەڕەتیـــان نـــا؛ گـــەیینـــە دیـــوار.

دیواریـــان چنـــێ، نزێکـــەی نێمقـــەد؛
ئـــــەبـــــێ دابنـــــێن حجرالاســـــود.

لــەســەر دانــانی، بــۆ بــە قــرمو قــالّ.
چەن تێرەی قورەیش[1]، کەوتنە گالــەگــالّ.

هەرکەس، هەوڵی بۆ، بەجێ یا بێجــێ،
ئەو شانازیە، بــۆ تێــرەی خــوەی بــێ.

کــەســێ نــەمــا، بــۆ ڕاویــژو پرســێ.
ئێسەو تاوێتر، ها، شــەڕ هــەڵگرســێ!

هــەمــۆ ســەرســامن، لــەم کــارەســاتە؛
لــە نــەتێجــەی ئــەم بــەزمو بــساتە.

ها! وەختە هــەڵــسێ، لافــاوی خــوێنێ،
کەعبــەیــش، ناتــەواو، هــەروا بمێنــێ!

ئەو کەعبە، وا هــەر لــە بێریــان مــاوە،
بیسو چەن ســالێ، بــەر لــەم ڕۆداوە،

چۆن خوا، لەبەر ئەو، اصحاب الفیلــی،
یــا قــەلــەمــار کــرد، یــا خــستە دێلــێ؛

بەلام نەیهێشتن هەڵکەنــێن بــەردێ،
لـــە دیـــوارێکی، بڕۆکـــێ گـــەردێ.

(ئەبرەهەی یەمەن، بەخێڵــێ ئــەهــات،
کە گەلی عــەرەب، لــە حــەمــۆ[2] ولات،

---

١ ـ یانێ: قورەیش، هەرچەن تێرەی بۆ؛ نەک: چەن تێرەییێک. بۆ هەرکام لە دو مەعنا، بە حاڵەتێ، تلفظ ئەکریێ.

٢ – هەمۆ؛ بەلام ئەم بۆ تەواوی استغراقە؛ یا هێ حاڵەتی تۆڕەیێ.

یالّلّــا، ڕۆ ئــەنــێن بــەرەولای حیجــاز، بۆ زیارەت کەعبــەو، بــۆ ڕازو نیــاز[١]!
یەمەنێش، زۆریــان، دڵیــان لــەو لایــە، دەزگــای ئــەبــرەهــە، لــە لایــان بایــە!)
ئەو کەعبە، وا، وا، پاراسـتی خـواوەن، لــە شــەڕ پادشــای زۆرداری یــەمــەن،
ئێــسە نــەســازێ خزمــەتکــارانێ، لــەبێــر باتــەوە نــاوی جــارانی؟!

**

ـ(ئازێزان! هەرچەن کەعبە، خۆ وەک زۆ، ماڵــە پاکــەکــەی تــەوحێــد نــەمــابۆ،
بەڵام هێشتا خەڵک، خۆیان لەسەر بــاو دێنــی ابــراهیم ئــەزانــی، بــە نــاو.
خەڵکیش تاوانیان نیە، چــۆن هــەر زۆ، خوێنمژگەل، یاسای دێنیان تێـک دابـۆ.
ئێسەیچ گەر ئەشراف، کاریان کەڵەکـە، میللەت، کەعبەیـان، بـە دڵ، گـەرەکـە.
هەر باوڕێ، خـەڵـک، بـە دڵ بیـانبــێ، حورمــەتــی هــەیــە، تــا حاڵییــان بــێ.
کەعبەیچ، هەم مەرکەز دێنی قــەدێمــە؛ هـــەم یادگـــاری ئـــەو[٢] ابراهیمـــە.
ئــەوەڵــێن مــاڵی مــەردم بــۆ قــەدێــم، هــەم بــۆ وچــان هــەم تزکیــەو تعلــێم.
ئەوەڵێن ماڵ بۆ، خــەڵــک بکـا تــەیـار، سەر نەخەوێنن بـۆ دەسـتەی زۆردار.
بۆیە، لەلای خوایش، هێـشتا بـەڕێـزە؛ هەرچەن ئێسە بـوت، تیـا بـەڕێـزە[٣].
هەرچەن کەعبەکــەی جــاران نــەمــاوە؛ بــۆ خــەڵکــی هــەژار، حــەشــارو داوە؛
بـــەڵام خـــۆ دنیـــا، هـــەروا نـــامێنێ: قانۆن ئەمو ئەو، خەڵـک بچـەوسـێنێ.
خۆ خوا، بەشەری چەوســاوەو دامــاو، سەرگەردانو وێـڵ، وێـڵ ناکـا تــەواو.
ئــــاخری، دێـــسان، ڕۆژێـــک تێتـــەوە؛ لـــە خـــەڵکـــی دامـــاو، ڕۆژ ببێتـــەوە.
کەعبەیش، ڕزگار بێ لەدەس بوتـداران، خاوێنو سادە، وەک جـاری جـاران) ـــ

ـــــــ

بەڵێ؛ ڕۆڵەکــان! خـوەیـشکان! برایــان! بچێنـــەوە لای کـــەعبـــەو کـــەعبـــەوان:

١ – وظیفهٔ ابرهه ـ که ادّعای پیروی دین (نصرانیّت) را داشت ـ تطهیر کعبه بوده؛ نه تخریب آن. زیرا پیروان این دین، سابقهٔ آنرا می‌دانند.
٢ – «ئەو»، سێ مەعنای هەیە، کە حاڵەتی وتنیان، فەرق ئەکا. لێرە، مەعنای «همان» ئەدا، لە فارسیا.
٣ – یانێ: ردیف.

کێشە، توندە، بۆ دانانی حەجەر. — هەر کەسێ هەوڵیە بکەوێتە بەر.
ئەم ئەیوت: جا، خۆ، من مێوانـدارم. — ئەو ئەیوت: خزمەت کەعبەیە کارم.
یەک ئەیوت: کاری من، ئاویاریە. — یەکێتر: ئەرکم، پەردەداریە.
هەرکەس، بە منطق، یا بە کەللاشێ، — هەر دەلێلێکی، بۆ خۆی ئەتاشی.
لە پڕ یەکێکیان، دەمی پێ بەستن؛ — وتی: ئاغەگەل! تاوێ، ڕاوەستن.
تەدبیرێکی سەیر، لە دڵمی، داوە؛ — هەرچەن تا ئێسە، نەبوەو نەکراوە:
هەمۆ دانیشین، بێ زڵەو هەرا؛ — کەسیچمان نەچێ، بۆ ئەم لاو ئەولا.
ئەوەڵێن کەسێ، لەو ڕێگاوە هات، — بیکەینە حەکەم، موشکڵمان حەل کات.

——

سەیر، قەبۆڵیان کرد هەمۆ، زۆ بە زۆ؛ — هەرچەن باسی وا، قەت نەکرابۆ.
(ئاخر، ڕەوشی بوتپەرس، هەمۆ، — فالی بە ئەزلام، یا چتی وابۆ)

## غەزەلی ٨: گەیشتنی لاوێک هەر لەو ڕێگاوە:

ئەوا، لە دۆرەو، پەیا بۆ جوانێ. — مەڵێ جوان؛ بڵێ: مانگی تابانێ!
هەی جوان! گش کەسم، بەلاگەردانت. — فیدای گەردو تۆز سەر سەرو شانت.
بە قوربانت بم بە هاواڵمەوە؛ — بە باوکو دایکو، سەرو ماڵمەوە؛
بە دڵو دیدەو، ڕۆحو گیانمەوە؛ — بە تاقە ڕۆڵەی ژێرو جوانمەوە.
تاقانەکەی نەک تەنیا دایکو باب؛ — بۆ تەئریخی ژێن، بێوێنەو نایاب[1]!
لە دەورت گەڕێم، جوانی خوینشێرێن! — سەردێری پاکێو ئەدەبو تەمکێن[2]!
هەی جوان! نمونەی «ماقۆڵیو جوانێ!»! — اسطورەی سەیری «هەیبەتو شوانێ!»!
دەرسی «تەمێسێ، بە شرەبارێ!»! — سەرمەشقی «بەرچاو تێریێو نەدارێ!»!
هەی جادۆی «ژێرێو نەخوەنەوارێ!»! — سیحری «دەسەلات بە کرێکارێ!»!

---

١ ـ لە کوردیدا، یانێ: استثنایی.

٢ ـ بە کوردێ، یانێ: وقارو شخصیّت.

هەی جوان! تەلسمی «ڕۆخۆشێو بڕشت!»!
«بزەت، شێرشکێن، هەر وەک هێزی مشت!»!

ڕەمزی «ناوداریێ، لەتەک نەداریێ!»!
ڕازی «سەنێنیێ بە هەرزەکاریێ!»!

بۆ ناحەق، دڵڕەق لە شەو تارێکتر!
لە گەل حەق، گەردەن، لە مۆ بارێکتر!

«حلف‌الفضول»ت، ڕازی بەزەو، قێن:
بۆ مەزڵۆم، نازان؛ بۆ زاڵم، تەزێن.

جامی جەماڵت، دڵی گوڵ تەزێن.
سامی کەماڵت، بەحرو کێو بەزێن.

کام مەغرۆری ماڵ، تۆشو ناتەبا،
پێ وابێ: زەوێ، سامی لێ ئەبا،

کە تۆ ئەبێنێ لە بەرامبەریا،
ئێژی، خوەڵو بۆڵ، ئەکەن بە سەریا!

کام ئافرەت، جوانەو؛ بە خوێ ئەنازێ،
بیەوێ لەلات، دەربڕێ ڕازێ،

سامی سەنێنێت، ئەیگرێ، بە تەرزێ،
وەک «وەنەن هەجێج» دڵی ئەلەرزێ!

بەبێ تەلارو؛ بەبێ دێواخان؛
بێ بگرەوبەردەو، بەردەو درگاوان؛

بێنازۆ نیعمەت، بەبێ سفرەو خوان،
شەرمت لێ ئەکەن ئاغە زلەکان!

ژیانت، زۆرتر، لە چوڵو کێوان؛
تاراو لە ناو خەڵک، لەتەک بەرخو ڕان؛

مەجلیس‌نشێنان، ماتن لە ژێرێت!
لە بردی قسەی لەگەل فەقێرێت!

*

ئەم خەڵکە، هەرچەن، بەچاو ئەوێنن،
بە سەروەت، خەڵکێ، هەڵ ئەسەنێنن،

کە چێ، «محمّد»، زۆر موحتەرەمە؛
هەر چەن لە ماڵا[1]، زۆر هاوسەر کەمە!

هەرچەن کەم عومرەو، بێ ماڵو نۆکەر،
دەوڵەمەنو ڕۆت، پێ ئەسپێرن سەر!

لای دۆسو دوژمن، مەشهۆر بە «امین».
ئاسمان، لە وەقری، شەرم ئەکاو، زەوێن![2]

*

ئەوەی ئاگای بۆ، لە دەورانی زۆ،
لە جوانەمەرگێ عبدالله، کەیل بۆ،

ئەیوت: شوکور لەم گەنجە مەزنە!
ئۆخەی، عبدالله، ئوجاخ ڕۆشنە!

——

١ ـ لە ماڵا: بە سەروەت.

٢ ـ توضیح دربارهٔ اینکه: راز تعارضها (یعنی: همهٔ خصال ممتاز معنوی، با همهٔ فشارها و کمبودهای مادّی)، در یک کلمه عبارت است از: «شرایط بزرگترین و عمیقترین و سعادتآفرینترین رهبری».

بەڵام ئەو داخە، هەر سارێش نابێ، لە دڵ دۆسگەلا، بۆ دایک و بابێ،
بە جوانەمەرگێ، سەریان نیاوە؛ نەیاندێ باڵای ئەم شۆڕە لاوە!

*

لەو سەریچەوە، خاستری نەمان، بوێنن ژێنی تاڵی ڕۆڵەیان:
مشتێ منداڵ بۆ، بەرغەلەوانێ، ئەکردو؛ ڕەنجی ئەدا بۆ نانی!
منداڵ بۆ ئەرکی خۆی، کەوتە سەرشان؛ لە تەک کۆمەکیچ بە ماڵو خێزان!
چ بە منداڵێو، ئێسە، کە گەنجە، ژیانی، هەمۆ، هەر سەختێو ڕەنجە!

*

ئەی جوان! ئەحواڵت، هەمۆ اعجازە. تەئریخی ژێنت، سەرانسەر ڕازە.
داخۆم چارەنۆس، چێ نۆسێوە بۆت، کە لێ نازانن، نە خەڵکو نە خۆت!

(کۆتایی غەزەڵی ٨)

ئازێزان! سەیر کەن کاری کردگار: جوانێ کرێکار؛ شوانێ شڕەبار،
پێخاوس؛ ماندۆ لە کرێکارێ؛ هەژارێ، لەسەر تا پای، ئەباری،
ببێتە حەکەم، بانترێن پێشات، حەلکا بۆ تاقمێ، سەرگەورەی وڵات!
ئەویش، کەسێ، خۆی جێگەی گومان بێ؛ ڕۆڵەی تێرەیێ لە تێرەکان بێ!
لەولایچەو هەمۆ، گلەیان لێ بۆ؛ چۆن لە ڕێی دێنی بوتان، لارێ بۆ[1]!
بەڵام سەرەڕای ئەمانە هەمۆ، هەر چاویان پێ کەوت، دڵیان سوکنا بۆ.
بە خاترجەمێ، هەمۆ وتیان: خاس! لاوێک هەم ژێرەو، هەم ئەمێن و ڕاس.
بانگیان کرد: کاکە! ئۆغرت خەیرە. بە زەحمەت نەبێ، بێبەرەو ئەیرە.
کارێکی گەورەو گران، ڕۆی داوە؛ هەمۆ دەرکێکمان، لە ڕۆ بەسراوە.
تۆ نەبی دەردمان، دەرمان کەی، ئێتر، بۆمان نەماوە تەدبێرێکی‌تر.
فەخری حەجەرنان لەسەر جێگەی خۆی، هەرکەس ئەی‌کێشێ هەر بەرەولای خۆی.
هەرچێ تۆ بێژی، گشت قەبوڵمانە. لە ئێمە، دەردو؛ لە تۆ، دەرمانە.

——

١ – توضیح احوال حنیف‌ها.

محمّد، نەختێ، سێودۆی دڵ خوەی کرد، تا ئاگری قێن، لە دڵگەل دامرد.
ئەنجا پێ وتن، لە دوای تاوێ: هەڵبژاردە کەن هۆزێ پیاوێ.
پارچەیێ گەورەی ڕاخست؛ حەجەری، بەدەس خوێ هەڵگرت، دای‌نا لە سەری.
جا لە هەر لاوە، هەڵبژاردەکان، دەسیان دا پارچەو؛ هێنایانە بان،
تا گەییە حاستی ئەو چێنەی دیوار، کە ئەبۆ حەجەر، بنرییێتە کار.
ئەوسا، حەجەری، بە دۆ دەستی خوەی، هەڵگرتو؛ دای‌نا لەسەر جێگەکەی.

## جێگەی غەزەڵی ٩: پەیوەندی ابراهیم و محمد

------------------------------------------------

------------------------------------------------

لاوێ، هەمۆ ژین، لە مەینەت، لێوان؛ یا کرێکارە، یا شوان لە کێوان.
لە هەرچێ بەشە، مەحرۆمو بێبەش. «کایە»و«مەجلیس»[1]ی، ڕەتان‌بۆ، لە کەش،
ئەخلاق‌و، قسەو، ڕەوشتی جوانی، وا، زۆ مەشهۆر بۆ، گش کەس پێزانی.
مەعنای ئەو «ناو»ە، کەس نەی‌بیستبۆ، بۆ ئەم جحێڵە، ئەونە بەجێ بۆ،
بڕێ کەس، بانگیان ئەکرد: «محمّد»؛ ئەم ئەی‌وت: «محمود»؛ ئەو ئەی‌وت: «احمد».
هەرکەس، ئەی‌ناسی، مات و سەرسام بۆ. دڵی حەسۆدی، پڕ ئێش‌و زام بۆ.
کردەوەو، قسەی، وا، ڕێکو ڕاس بۆ، ناوی، لە ناوان، بە «أمین» دەرچۆ.
باسی، وا دەنگی داوە لە شاران، ئاواتیان بە ئەو ئەخواست، زۆرداران.
لەگەر ئەو هەمۆ حوسنە بێوێنە، وەرەو؛ ژیانی تاڵی، بوێنە!

----

لە شاری مکّە، ژنێک دەوڵەمەن، تیجارەتی ئەکرد لە شام تا یەمەن.
ژنێک ڕاس‌و پاک، دۆر لە فرۆفێڵ؛ ئەویش، لە ژنان، تاقانەی ناو خێڵ.

١ – کایەی منالێو، مەجلیس‌نشێنێ لە لەوەولا.

خدیجە، قەڵس بۆ، لە کار تەشقەڵە؛ — پێ خۆش بۆ ڕاس بێ، سەوداو مامەڵە.
لە حەقی خەڵکێ، قەت نەبۆ تەمای. — ئەو ماڵە زۆرەیش، کە کەوتبوە لای،
بۆ کوت فرەی، خوەی، هەوڵی نەدابۆ؛ — ارثی چەن کەس بۆ، بۆی بەجێ مابۆ.

——

لە پاکێ احمد، کە ناویان ئەبرد، — لە دڵی پاکی، زۆر کاری ئەکرد.
فکری کرد: بەخوا، ئێژم لەمەولا، — بسپێرمە ئەو، مامەڵەو سەودا.
ناردی بۆ ابوطالب، پەیغامێ: — ئەوا کاروانم، دەچێ بۆ شامێ.
ئەگەر ڕێک کەوێ، احمد بنێری، — پێم خۆشە کاروان، بە ئەو بسپێری.
ابوطالبو محمّد، هەر دۆ، — بەم سفارشە، زۆر دڵیان خۆش بۆ.

*

کاروان کەوتە ڕێ؛ کاروانێ، داجوین، — بە سەرکەردەیێ احمدی ئەمێن.
قافڵەچێ جاران، بەر لەم سەفەرە، — خزمەتکارێ بۆ، بە ناو «مَیسرە».
ئەمجار، خدیجە، ناردی، بەو بۆنە، — بزانێ: ڕەفتار محمّد، چۆنە؟
بێدەنگێ پێ وت: بە نادیارێ، — سرنج بە لە خەرج، لە سەوداو کاری.
داخۆم بەجێ، وا، باش ئەکەن باسی؟ — ناوی دەرچوە، بە پاکێو ڕاسێ؟
داخوم بەردەسی بکەوێ پارە، — بە لێژاو، هێشتا، ئەمانەتدارە؟

*

کاروان هاتەوە زۆتر لە جاران؛ — کە چێ نەفعیشی، هێشتا ئەیدا بان!
لەبەر سەرڕاسێ، مامەڵەیان زۆ، — تەواو بۆ؛ خەرجی کاروان، کەم دەرچۆ.
مەیسەرە، هەرچەن، تۆزێ دڵمەن بۆ، — کە: سەرکاروانێ، لە دەسی دەرچۆ،
بەڵام، ئەخلاقی قافڵەچێ تازە، — ماتی کردبۆ، زیاد لە ئەننازە.
لەجێ حەسۆدێ، یا قێن لێ کردن، — یا «داخی قەسەم بە بوت نەخواردن»[1]،
سەرسام بۆ، دڵێ صەد دڵ، حەیرانی؛ — فرێفتەی قسەو ڕەفتاری جوانی.

---

١ ـ توضیح.

هەر لە دوۆر، قافڵە، گەییە نزێک شار، — تەقڵەکوت، ڕای کرد بۆلای خاوەن کار.
هێچ ئاگای نەبۆ: شەکەتەو ماندۆ. — کۆچو کاروانی، هەر لە بێر نەبۆ!
بێ چاکەو چۆنەو، بە بێ وچان دان، — ملی نا باسی چاکەی سەرکاروان:
خانم! لە ڕاسێ و پاکێ ئەم لاوە، — چێتان بێستوە، هەر ناتەواوە!
سوێن بە مناتو لاتو عزّی بێ، — بە ڕاسێ، باسی، هەر تەواو نابێ.
لە خۆی پەسەندی، چێتان بیستیە، — فرە، کەمی هەس؛ زیادی، نیە.
من، لە ئەوەڵەو، زۆرم پێ تاڵ بۆ، — کە: سەرکاروانێ، چەنای چەن ساڵ بۆ،
بە من بۆ؛ ئەو، لێ سەنەدم، بە ڕاسێ، — گەلێ کرمۆڵ بۆ دڵم لە حاسی.
بەڵام، خوا ڕاسەو؛ ڕاسی پێ خوەشە: — بەشی، زۆر زۆرە لە هەرچێ بەشە.
خۆ، پێم ناکرێ، خۆ، لە حەق لادەم: — ئەوەی، دێومە، کەس، نەیدێوە بە چەم!

## جێگەی غەزەڵی ١٠: ئیزدیواج لە گەڵ خدیجە.

---

---

چل ساڵ، تێپەڕێ، زەمانی ماندۆ، — لەو ساڵەی مەشهۆر بە «عامالفیل» بۆ.
زەمان، چ زەمان؟ سەنگێن بۆ هەژار، — وەک تەوقی زاڵم، تاڵ، وەک ژەحری مار.
ترپەی هەنگاوی عومری بە بەلاش، — وەک دەنگ هارەکر، هارەی بەردەئاش!
لەسەر مێشکی خەڵک، خەڵکی بێهاوار، — هەر تاوێ صەد ساڵ، زەجرەوەو ئازار.
لە چارەڕەشێ میللەتی بەدبەخت، — بە ڕاسێ: «ئاسمان بەرزو؛ زەوێ سەخت»!
لە هەر ولاتێ، تاقمێ زۆردار، — سەرمەستی خۆشێو، بەدمەستێو، قومار.
لاییێک، بە زۆرو؛ لاییێک، بە تەزوێر، — خەڵکیان کردوە، زەلێلو یەخسێر.
بە بادەی دورۆ، ئەفسۆنی خەیاڵ[1]، — خەڵک، لە ژێنی خۆ، کاسو بێهەواڵ.

١ – توضیح دربارۀ اثر مهمّ «امانیّ»:...، لا یعلمون الکتاب، الاّ امانیّ؛ و ان هم الاّ یظنّون.

ژیان، گرساوی فاڵو ئەفسانە، بۆ پشتەوانەیچ، بوتو بوتخانە[1]!
گەر یەکیەکێکیچ، بڕێ وریا بن، بۆ حەق دەرخستن، لە تەقالا بن،
یا لە ناوی ئەبەن، یا بە زەبرو چەنْگ، ئەیخەن لە هاوار، یا ئەیکەن بێدەنْگ.
یا ئەگەر نەختێ، ئیمانی سس بێ، دڵی، لای دنیاو؛ ماددەپەرس بێ،
لە گۆشەی دڵیا، لە ژێن بەو لاوە، هەمۆ شتێکی، نابێتە لاوە،
زۆردار، ئەیکڕێ، بە زەربی دراو؛ ئەویش، بۆ گیان خەڵک، ئەوێتە جەللاو[2]!

---

ئەو ملّەتەیش وا، بە ناو دێندارە، هەر وەک بوتپەرس، مل بەختی، لارە.
مەلایان، زۆرتر، هاودەس زۆردارن، ئەوانیش، دوژمن خەڵکی هەژارن.
یەکیەکێ نەبێ؛[3] ئەحبارو ڕۆهبان، دێنیان کردۆتە دەسمایەو دۆکان!
زۆرتر لە بێدێن، دێن ئەکەن تورۆ، بە دۆعاو، نوشتەو، ئەفسانەو، دورۆ!
لە جێگەی هەرچێ باسی بە کەڵکا، لەوانە ئەکەن بە قورگ خەڵکا!
لە داوتەنێنو، «هاوسا وەزەنێ»[4]ن، هەم لە باتێ کار، هەم لە جیاتی دێن!:
لە باتێ دێنی زوڵم لەناوبەر؛ پایەی ئازادیو موساوات دانەر.
دێنێک، سەربەستێ، ئەداتە انسان؛ خەڵکێ لەتەک یەک، ئەکاتە هاوشان؛
بە ئینسان ئەڵێ: خۆت نەشکێنی: بۆ قانونی خەڵک، سەر نەخەوێنی!؛
تەنیا، خاوەنی زەوێنو ئاسمان، ئافەرێنندەی گیاندارو بێ گیان،
کە نەزمی گیانو، ژیانت، بەوە، کە پەروەرندەی عاڵەم، هەر ئەوە،
ئەتوانێ: بەشەر، لە نەگبەت لابا؛ بۆ تۆ سەرمەشقی «چۆن ژیان»، دابا.
نەکەی لە داوی ئەمو ئەو کەوی!: پۆڵ، یا زۆر، یا گەڕ، بتکا سەرنەوێ!
تۆ؛ ئەگەر چاروا، هێسر، مەڕو ماڵ، نەخۆش، بکەوێ، ئەیبەی بۆ بەیتاڵ؛

---

١ – توضیح اینکه: حتّی علمای دینفروش هم، به صورتی، مردم را مسحور بت و بتخانەهای خاصّ خود، ساخته بودند.
٢ – نمونەهای بیشمار و همیشگی در همه جا.
٣ – مستثنای مقدّم.
٤ – یانێ: تەڕک بن لێفە.

پێلاکەت، تەنگ بێ، دەسەداوێنی — پێنەچێ ئەبی، کە بیڕەوێنی؛
دێوارت، شەق با، بەرەو لای بەنا؛ — ماشێنت[1] بشکێ، بۆلای شارەزا؛
سەعاتت بشکێ، بۆلای ئەهلی فەن؛ — جمگەت، دەربچێ، لای شکسەبەن؛
یا ئەگەر ڕۆژێ، نەخۆش بکەوی، — دەسەداوێنی حەکێمان ئەوی.
خولاسە: هەر کار، یا دەردێکت بێ، — لای کەسێ ئەچی، سەری دەربچێ.
دەی توخوا، تۆ خۆت، ببە بە قازێ: — ئەمە ئەزانی، چۆن ئەبی ڕازێ،
کە: بۆ دەرمانی دەردانی کۆمەڵ، — کە مایە ئەگرن، لە دەرۆن تەڵ تەڵ،
دەسەداوێن بی، بە یاسای انسان! — انسانی انسان نەناسی[2]، نەزان!
تۆ خۆت ئەزانی: کەس ناناسێ، خۆ، — دنیای بێبنیای ڕەوانی مرۆ.
جا، توخوا، ئاخر، انسانی مەزن! — خوەت، پێ کەمترە، لە پەزو بزن؟!

——

ئەمجار، لە دنیا: هەواو، بەحرو، بەڕ، — نەقشی، هەس بەشەر؛ بە خەیر؛ یا بە شەڕ.
بەرنامەی، ئەر نەو هاونەزمی عاڵەم، — بۆ خۆیو عاڵەم، ئەبێتە وەرهەم.
بێستۆتە کە: بێ «محیطشناسی»، — نەقشەو تەرحێ، سەر نایرێتە ڕاسێ.
کە وابۆ، شەرتە، بۆ قانۆن دانەر، — چاو کا هەم وەزعی عاڵەم، هەم بەشەر.
بەشەر، بێنەزمێ ئاوا، ئاوایە، — کە نەگبەتی، پڕ تەواو دنیایە:
لە صەد لا، ئەمرێ، ڕۆژێ، هەزاران، — لەبەر برسیەتێ، بۆ تێکەیێ نان؛
بڕێکیش، لەگەڵ خواردن، تێرو پڕ، — لۆتاوێژ ئەکەن؛ ئەخەن پاشا خوڕ![3]
چەن وڵاتێکی، لە ویجدان تەرێک، — بۆ پێشکەوتنی قودرەتو تکنێک،
چێ بەسەر بەشەر تێرن، بەهەر حاڵ، — بە گاز کارخانەو، بە ئاتو ئاشغاڵ،
هەواو دەریایان، مەسموم کردوە؛ — سەمیان، تا ئەعماق زەوێ، بردوە!
بەمانە، نەسڵی گیاو گیانداران، — لە خەتەرایە، وەک نەسڵی انسان.

———

١ – ماشین، عامّ است.

٢ – توضیح دربارۀ استحالت معرفت کامل انسان، برای انسان.

٣ – نوارها؟

دێن ئەڵێ: انسان! ژێرانە بڕوا[1]:    تەواوی دنیا، بە تۆ؛ تۆ، بە خوا!
خوا، دنیای پێدای، بە پێتێ بێداد؛    بە خۆیشت، گەلێ مایەو استعداد،
تا استعدادت، لە کار بشکێنی،    چێت پێ، پێوێستە، بە دەستی بێنی.
بەڵام، پەروەرش خۆتو کۆمەڵت،    بانترە لە کار ماڵو ئاژەڵت.
ئەو خوا، نەزمی‌دا، بە دنیای بێگیان،    هەر لە ئەتومێ، هەتا کاکێشان،
غەریزەیچی دا جنسی گیان لەبەر،    لە میکروبێ، تا ماسێو پەلەوەر،
ـ ئەو گش گیاندارە، کە نایەنە حەساو،    لە وشکێ، یان لە هەوا، یا لە ئاو ـ،
هەر ئەو، لایقە، بەرنامە، دێسان،    دانێ، بۆ بەشی تایبەتێ عێسان.
بەڵام هێشتا ئەم زیادە بەشانە،    چەنێ بانترە، لە ئەو دوانە،
ئەونەیچە، نەزمی تاویەتێ، بانە،    بۆ ئینسان: کۆگای ئەو هەر سێکانە.
(ئاخر، بێژگە ئەم بەشە سێهەمە،    ئەو دۆ عالەمەیش، لە تۆدا، جەمە)
جا، چلۆن حەیوان، بانترە، کاچێ،    بە تەنیا نەزمێ، بەرێوە ناچێ،
تۆ، کە بانتری، گەلێ لە حەیوان،    بێ‌نەزمێ زیاتر، نابیتە «انسان».
ئەمجارە، ئەگەر بەشەر بتوانێ،    نەزمی طبیعێو غریزێ، دانێ،
بژین، بۆ نەزمی سێهەم، بەهەر حاڵ،    هەرچەن بانترە، بکا قاڵمە قاڵ!
وەلێ ئەزانی فەرزی مەحاڵە؛    هەرچێ هەوڵ بدا، هەوڵی، بەتاڵە.

——

نەزمی طبیعی دنیای خوارو ژۆر،    تێک بچێ،[2] بزا: چۆن ئەبێ خاپۆر!
یا خۆ غەریزە، گەر ببێ بەتاڵ،    ژیان لە حەیوان، چۆن ئەبێ مەحاڵ:
کە دوای چەن ڕۆژ، وەها ئەگەنێ،    نەبێ بێگیانێ، وەها بۆگەنێ!
بەشەریچ، نظام دێنێ، وەلا نێ،    زۆر پەستر ئەبێ لە هەر حەیوانێ.
هەرچەن سەرکەوێ عیلمو سەنعاتی،    پەسترو پێستر ئەبێ، حەیاتی.

١ – تەماشاکە.
٢ – وەک ڕۆژی تەواوبونی ئەم دەورانەو، هاتنی نۆرەی دەورانیتر.

گەر بێتو، پاشەکشێ کا انسان، نەزمی دێن، وێڵ کا، نابێتەو حەیوان،
وای لێ تێ، هیچێ، وە حاڵی نەوێ! بە ڕاس، اسفل سافلین»، ئەوێ.
بەڵام ئەگەر دێن، بە ڕاسێ، هەبێ، ئەو دۆ نەزمەکەیش، جا مثبت ئەبێ.
گەلێ،[1] گەلێکیچ[2]، کز بێتو دەمچەوت، ئەکەوێتە سەر شارێگەی سەرکەوت.
خۆ بەسەرهاتی ئوممەتی قورئان، لەبێر ماوە، نەک وەک باقێ گەلان:
تا وەختێ بە ڕاس، پابەندی دێن بۆ، ڕۆژ بۆ ڕۆژ، زیاتر بەرەو پێش ئەچۆ.
کاتێ کە کەمکەم، ناوێ[3] ما بێناو[4]، بەرەو دواهات، هەنگاو بە هەنگاو.

——

جا، هەرچەن، تەئرێخ، لە تۆڵو عەرزا، لە شەرقو غەربو، لە خوارو، بەرزا[5]،
پڕیە لە ژێنی نەنگێنی وەها، کە حەتتا بەراز، لێ ئێترێس ئەکا،
بەڵام لە چاوی «کوگای[6] بێدێنان»، چەت دێوە، وەسە شێرێنێ خوەران!
یانێ: کۆمەڵێک، فکرو، خوێ دێنێ، لە هیچ بارێکەو، تیا نەبێنی.
ئەنجا بڕوانە بۆ کارو باری؛ بۆ دنیای تاڵتر لە ژەحری ماری!
ئاخر، لە هیچکوێ، گەلێ ناوێنین، کە تیا نەبێ، شوێنەواری دێن.
چونکە فرەیێک مەبەستی ئایێن، لە فەرهەنگەلا، بوە جێنشێن.
مەسەلەن: زۆر هەن، بە فکر بێدێن (جا، یا بێدێنێ سەتحێو ناشێن،)
(یا، بە فەنبازێ، بۆ خەڵک خلەتان، یا لە بەر زۆری[7] فەرهەنی انسان)،
لە زۆر دێنداری بە ناو، ساقترن! لە بڕێ بارەو، بە ئەخلاقترن!

——

١ – میللەتێ.
٢ – فرە.
٣ – اسم.
۴ – محتوی
۵ – جنوب و شمال همانند «ژورۆ، وە خوارۆ».
۶ – بڕێک، حەقیانە، کە بۆ جەماعەتی مەردمی دنیای ئەمڕۆ، ئەڵێن: «تودە»، کە یانێ: «کۆگا»؛ کە لە «ڕان» و باقی کلماتی خاصّی حەیواناتیش، پەسترە.
٧ – قدرت و فشار.

بەڕاس، سەیرە بۆ بێدێنێ، ئەخلاق.        بەلاجەوێتر: دێنی بێئەخلاق!
چونکە، دێن، دارەو؛ ئەخلاق،ئەمەری.        لە لایێک، دار بێو؛ لایێکتر، بەری؟!
بەلام بەشەرەو، هەزار ڕازی سەیر!        کۆگای هەزاران باری شەڕو خەیر!
ئاخر، بۆ بێدێن، هەر ئەم دنیا هەس؛        ئەویچ، بێخاوەن، وە[١] بێ سەرپەرەس!
داری ژێن، کە مرد، دەرناکا وەچێ.        جا، هەرچێ نەیکا، لە کێسی ئەچێ!
بێدێن هەیەو؛ هەر دنیایێک مادێ،        جا ئەگەر ژێرە «اخلاق» یانێ چێ؟
(بە خوا، جەماعەت! قسەی خوەمان بێ؛        ئەم باسە، لە بەین خوەمان، دەرنەچێ:)
(وا دیارە، بڕێک، وریاو بە بێرن؛        ماشەڵڵا هەزار ماشەڵڵا، ژێرن!)
بەڵام بۆ دێندار، ئێرە، مەزرایە؛        نوخشەو خەرمانی، لە ئەو دنیایە.
دێندار، ڕێبواری ڕێگەی ژیانە،        وەک صەدها دەورەی بەر لەم دەورانە:
هەر لە خاک، هەتا، چۆزەرە گیا،        تا وەک خوێن، لەناو لەش گەلا، ژیا،
هەر لە نوتفەوە، تاکۆ ئاوەلەم،        هەرتا تێپەڕی چەن دەورەی ڕەحەم[٢]،
خولاسە: لەوسا، هەستێ، بەدێ هات        وەک دۆکەڵ، هەتا پەیابۆن حەیات،[٣]
لە پلەی «اذ أنشأکم»، هەتا،        «خلقاً من بعد خلقٍ»، گوزەرا[٤]،
هەزار ڕێبازی ژێنی، دا پاوە؛        هەزار جار مردو؛ دێسان ژیاوە.
دێندار ئەزانێ: ئەم ڕێگە دوورە،        داویەتە پاوە تا ئەم سنوورە،
بەم دەورە ژێنە کورتو بێمایە،        هەروا، بە فێرۆ، دوایێ نایە.
ئەم جارەیچ کە مرد، وەک جارەکانتر،        هەڵ ئەداتەوە بۆ ژێنێ بانتر.
بە نسبت ئێمە، ئەم کۆچە، مەرگە؛        چونکە دەرئەچێ[٤] لەم خێڵو جەرگە.
هەروا منالێ، لە ڕەحەم دەرچێ،        ئەگەر منالتر، لە ڕەحەما بێ،

---

١ – : بە.

٢ – در زبان کردی، «ڕەحەم»، برای بچەدان، درست است، بمعنی شفقت، هم «ڕەحم» و هم «ڕوحم»، استعمال می‌شود. پس، باز «صیلەی ڕەحم» گفتن، بهتر است، تا «رَحِم».

٣ – آیات با تفسیر

٤ – مرجع ضمیر، از جمله‌های قبل، معهود و معلوم است.

پێوایە: مردو؛ ئێتر، لەناو چۆ. چە ئێمە ئێژین: ئەوە پەیا بۆ!
ئەوەننەی هەیە: دەورەکانی زۆ، چۆن تێپەڕ ئەبۆن، بە خۆمان نەبۆ.
مەگەر هەر تەنیا دەورەی ئاوەلەم، کە جم جۆڵێکمان[1] هەبۆ، زۆر یا کەم.
بەلام، ئام[2] دەورە، کە هەڵمان داوە، پامان لە مەیدان «اختیار»[3] ناوە،
بە دەس خوەمانە چۆنی بەینە سەر: دەورەی‌تر، قازانج بکەین یا زەرەر.
(مەگەر ئەوانەی ، سەر لێشێواون؛ وە یا خۆ زگماگ، هەر ناتەواون)
(کە مەسئۆلییەت، ڕۆیان تێ ناکا. خوایچ، پاشەڕۆژیان، پاشان لێ ناکا)
پەڕانپەڕ دنیا، بۆ انسان، وەسە: زیندانێ؛ یا وەک ئەم مثالەسە:
لە باغەوەحشێ بێ درگاو باڵێن، بان و دەورە تۆڕ، چەن هێلکە شاهێن،
پەروەردە بکەی؛ تا جۆچک هەڵ تێ؛ جۆجەڵە هەڵۆ، پەڕەوازە بێ.
تۆزێ تێفکری لە پەڕو باڵیان، لە هێزو تەکان، لە حاڵو باڵیان،
ئەزانێ: مەل وا، بە وەزعێ واوە، بۆ ئەو فەزایە، دوروس نەکراوە.
ئەبێ بۆ هەڵۆ، دنیایێک وەها، هەبێ[4]، توانای، تیا گوڵ بکا.
لە تەواو ئاسمان، یا لەم زەوییە، تێفکری، هیچێ[5] لە خۆڕا نیە.
ئەمە ئەصڵێکە، بەدیهێو عادێ؛ وەسە ئەلفبێی عولۆمی مادی.
زانایێک، کاری، تەحقیق بێ لە کار ئاسمان یا زەوێ، بێگیان یا گیاندار،
لە میکروب تا فێل، ئەتوم تا کێوان، مەنزۆمەیێک ورد، هەتا کاکێشان؛
هەر چتێ تازە، بەرچاوی، کەوێ، پەیجۆر بۆ کارو بۆ فایەی ئەوێ.
پەس، بۆ محقّق، وە بێ قالو قێل، «غایت»، ئاشکراس؛وەک ئەصڵی تەعلێل.
بێروڕای وەسە فەیلەسۆف دێن، جا، ماتریالێست، خوەشی بێ، یا قێن!
دێسان تێفکری لە حاڵ ئاوەلەم، ئەزانێ: دنیای تەنگەوەر ڕەحەم،

١ – با حذف «واو» عطف به لهجهٔ «لەیلاخێ».
٢ – اشاره بۆ فره نزێک.
٣ – توضیح دربارهٔ فرق بین اختیار حیوانی و انسانی.
٤ – توضیح لەبارەی سێ جۆرە «بۆن»ەو؛ وە بەکاربردنی «هەبۆن» لەباتێ یەکێکیان.
٥ – هێچێ ـ هیچچی. هێچ ـ هیچ.

نـابیٚ ئـاخریٚن مـاڵی ژیـان بـیٚ؛ له شویٚن ئەو ژێنه، نۆرەی نەمان بـیٚ.
انسانیچ: کۆگای نێرۆی خەیر و شـەڕ، خـاوەنـی مایـەو ئـاواتی بـیٚپـەڕ،
قـەفـەسـی دنیـا، نـادا مـەجـاڵی، کـە تـا ئـەتـوانیٚ، بـدا بـای بـاڵی.
باشـیش وردەو بـین، نـسبتی انسان، له گەل مـەیـدانی ئـەم دەورەی ژیـان،
گـەلـیٚ نـاجۆرتر، دۆرتـر ئـەوینـێن، لـە تـۆڕو هـەڵـۆ، ڕەحـەمو جـەنـێن.
پاشانیچ، بۆ ژێر، خۆ خـاسو خـراو[1]، واقعیـّـەتـن؛ نـەک خـەیـاڵ، یـا بـاو.
ویجـدانو زەوقـی هـەمـۆ انـسانیٚ، هـەرچـەن شـێوابیٚ، ئـەمـە ئـەزانـیٚ.
ئەمجار، بڕوانـە بـڕیٚ چـۆن ئـەکـەن؛ له عومری دنیا، چۆن بەهره ئـەبـەن؟:
یـەکـیٚ، بـەرامبـەر زۆردارو، دوڕۆ، ئـەویٚـسیٚ، بـا حـەق، بکـەویٚتـە ڕۆ.
هەوڵی بۆ خەیری خەڵکـە، بـە جـۆریٚ، لەهەر خۆشییێک، دەس دائـەشـۆریٚ.
ژیـانو، هـەمـۆ شـتیٚکی بـە کـەڵـک، ئەکا بـە فیـدای ڕزگـاربۆنی خـەڵک؛
هەرچەن کە خەڵکیچ، قەدری نـەزانـن؛ هـەزاران نـاوو نێتکـەی پیـانن!
لەولایچ بڕوانـە: هـەزار ئـەکـەی بـڕ، ملهـوڕ، یـا زکهـوڕ، یـا دولانـەبـڕ.
بـۆ لـذّتو خـۆش ڕابـواردن، یـا بـۆ زۆرو مـەقـام، یـا مـاڵی دنیـا،
عاڵـەمـیٚ ئـەکـا گێـرۆدەی دەردان، له کۆرپەی سـاوا، تـا پیٚـری زورهـان.
تانـە، بـە پـۆڵو پـارە، تانـە زۆر، یا نه بە دوروۆو کەڵـەکـی جـۆر جـۆر،
تانـە بـە کوشـتن، یـا تانـەو نافـات، ئـەیـەویٚ ولات، بکـا کـشو مـات!
هەرخۆی، ئـاواتی بیٚتـە دیٚ؛ بـە تـۆن؛ هەزاران هـەزار، زەجـرەوەکـوژ بـۆن!
ویجـدان ئـەزانـیٚ: ئـەو دوه نـابیٚ، کـردەوەو کاریـان، هـەروا فـەنـا بـیٚ.
نه ڕەنجی خاسان، ئەچـیٚ بـە بـەلاش؛ نـە زوڵمـی زاڵـم، بـیٚ جـەزاو پـاداش.
چۆن وەک یەک دەرچن: چاکەو ناحـەزیٚ؛[2] عبـدالله و حجـّـاج، حـسین و یـەزیٚ؟!
دیٚنـدار، ئـەمانـە، ئـەبـیٚ بزانـیٚ. جا چۆن بۆ ئـەملا، ئـەولای، وەلا نـیٚ؟!

١ – هیچ انسان بدی هم، بدی را، خوب نمیخواند. بلکه با توجیه، بدیهای خود را، خوب می‌نمایاند.
٢ – منظور، همان مسألهٔ مشهور «حسن و قبح» است.

بە خوا، چەن سەیرە، بەشەری بێدێن، ڕازێ بێ، دنیای، تاڵ بێتو بێتێن،
لەوە سەیرترە: کەسێ دێندار بێ؛ کەچێ بۆ دنیا، بە هەڵپەو هار بێ!
(ئەم دوە، گەر باش، هەڵیان سەنگێنین، ئەویان، دێندارەو؛ ئەمەیان بێدێن!)

*

جا با ئازێزان! پاش بەینێ لادان، بچێنەوە سەر باسەکەی خوەمان:
بەخوا، خەڵکێنە! هەرچەن سەیر ئەکەم؛ سرنجی هەمۆ خوارو ژۆر ئەدەم،
چ لە ناو گەلی مەسێحێو جۆدا، صابئو مەجۆس، پەیڕەوی بۆدا،
کە خۆ، بە خەڵکی دێندار ئەزانن؛ گوایە لە سەر ڕێ پەیغەمبەرانن،
تاقمێ بەناو ڕەهبەرانی دێن[1]، خەڵکیان کردوە لە دنیاو لە دێن[2].
بڕێک، هەرخۆیان، قودرەتمەدارن؛ بڕێک دەسەنەخۆری دەسدارن.
بۆ زۆرتر بۆنی جیرەو، سۆرو سات، هەرچێ قانۆن بۆ پێغەمبەران هات،
یا بە تەواوێ، هەر لە بەینیان برد؛ یا بە باو دڵ خۆ، دەسکارییان کرد.
میللەتی ئەمان، بێئامانترن؛ لەجێ بەجێ ماو، بەسەزوانترن.
هەر لا، بۆ چێنێک، زانێن، بانترە، چەوسانەوەی خەڵک، زۆر ئاسانترە:
بە فرێ زۆرتر، زۆری فرەتر، خەڵک ئەخەوێنن، وەک «پسدانی مر»!

——

یەکەیەکەیێ مەلای بە ئێمان، لەملاو لەولا هەن، بەڵام دەسەو سان.
کەسێ قسەیان ناکرێ بە بەلاش، لەبەر هەزاران مەلای دەم هەراش!
یا خۆ، لە ترسی هاودەسێ مێرێ،[2] پەنایان بردوە بە گۆشەگێرێ.
یاران! چێ بڵێم لە زوڵمو بێداد؟! بە ڕاس لە هەرلا، «ظهر الفساد»[3]!
تەمو دۆکەڵی ڕۆژڕەشێ بەشەر، ئەگرێ هەناسەو؛ ئەبا مێشکی سەر.

---

١ – هەرکام، بە مەعنایێک.
٢ – حکومت.
٣ – متن آیە با تفسیر دو دستۀ فساد (اعمال، و نتایج آن).

قسەی دەسدار، زل؛ دەسی هەژار، کوڵ.     هەر بە وجدانێ، دڵی، تێتە کوڵ.
جارجاریچ بۆ کار خۆیان، زۆرداران     بەر ئەدەنە گیان یەکتر هەژاران.
چەنها هەژاری داماو لە هەڵا،     بە دەسی یەکتر ئەبن کەلەلا.
ئەوێتە بڵحاح. یاخوا، نەیبینی     نەتێجەی دنیادۆسێو بێدێنی:
ڕۆڕۆ هەڵئەسێ، لە هەزاران ماڵ:     بۆ کوڕ، دایکو باوک؛ بۆ بابا، مناڵ؛
خوشکان، بۆ برا تاقانەکەیان؛     ژنان، بۆ مێردی جوانە مەرگەیان.
لە برێنداران، ناڵێنو هاوار؛     یاخوا نەیژنەوێ، گوێچکەی گوێچکەدار!
ئەمانەو، هەزار کوێرەوەرێتر؛     برسێو ڕۆت کەوتن، قوڕ بە سەرێتر.
بۆچێ؟ با ئاغە، ساز بێ دەماغی!     بەش خوەیان چیە؟ مەرگو ناساغێ!
میللەت، لە باتێ وە خۆیان کەون،     بۆ دەفعی زوڵمو کەڵەک، نەسرەون،
زۆربەیان، حۆلی بوتو بوتخانەن؛     یا ورۆ کاسی ڕازو ئەفسانەن!
بە بڕێ ئاوات، فەلسەفە پۆچە،     خەڵکیان خستوە وە خەوەنوچە!
لە باتێ دێنو فەلسەفەی خەبات،     ڕەهبەرانیان هەن بۆ پردو صیرات!
شلتر لە شێرو، خاوتر لە فرۆن.     دەمتاقی مەلای هەوانە دورۆن.
یاخۆ ئەگەریش، نەختاڵێ ژێرن،     لە داوی ژێنی دنیا، ئەسێرن!
ئەونە کوڵوڵن، وا نەگبەتیانە،     لەتەک یەکترا، ڕەقابەتیانە!
جا، چەن گرانە، بۆ مەلای ڕاسێ،     بە خەڵک، حاڵێ کا، خراوێو خاسێ!
خولاسە، یاران! دنیا سەرتاسەر،     تاپلوییێکە بۆ بەدبەختێ بەشەر.
عەدڵو داد، بۆتە باسی لە مێژێ؛     گوڵوڵەی بەختی، کەوتۆتە لێژێ!
بە ڕاس ئومێدێک نەماوە، انسان،     تازە ببێنێ ناوچاوی ژیان.
حەتتا، بڕاوە ئاواتو بریای.     تەنیا مەگەر خوا بگاتە فریای.

## جێگەی غەزەڵ ١١: دەربارەی آیات:

**الم اعهد اليكم...؛ و... معيشة ضنكا، و... لا يغرنّكم بالله الغرور و...**

________________________________________

________________________________________

لەم شەوەزەنگەی لە ڕۆژ بێزارە،     کە ژیانی خەڵک، ئازیەتیْ بارە؛<br>
کە ساڵی کوڵوڵ، هەمۆ پاییزە؛     ناوچاوی حەیات، لە بەهار زێزە؛<br>
کە ڕەشە، بەختی هەژار، وەک شەوە؛     لە کپیْ، هاوار، دەنْ ناداتەوە؛<br>
ناکاو، لە شەویْ لەو شەوگارانە،     لەو شەوە ڕەشە بیْ هەسارانە،<br>
شەپۆلێک لە نۆر، لە زڵەی ئاوات،     هێوای ژیانی، خستە سەر بیسات.

___

چەپکیْ لە گوڵو، چەپکیْ لە نەرگیز.     مەرگتان نەبێنم هەرگیزاو هەرگیز.

## جێگەی غەزەڵی ١٢:

**سەرەتای هاتنی وەحیو مەعلۆم بۆنی ڕازی عجایەباتی چەندین ساڵەو...**

________________________________________

________________________________________

# بەیتی «لانسار»[1]

١ – بەیتی لانسار: لوێچێکە لە خەرواری ژیانی ـ زیاتر ـ مەعنەوی مەرحوم کاک ئەحمەدی موفتیزادە... بە قەڵەمەکەی خۆی...

## بەیتی: «لانسار»[١]

### «های..! خاڵۆ ڕێو گار[٢]! ڕێگەزانی دنیای دیارو نادیاری[٣] ژیان! ← ڕێگە نازانم![٤] » (١)

--

خوایا! وا لە کۆساری هەڵەتی[٥] پەڕنادیاری[٦] ژیانا، ← لە بێکەسیو ناشارەزایی، ڕاگەم لێشێواوە. + ڕێم هەڵە کردوە، لە لانساری.. کلێڵە[٧] گری.. پڕ لە کرێوە و کزەبا ← پڕ لە جڕ و جانەوەری دڕو.. ← لە دێوو درنج. + ئەڵێی صەدها ساڵە، ئەم شاخانە[٨]،← هەرگیز بەهاریان[٩] بە خەو نەدیوە! + تارێکێچ[١٠]، وەها گۆژنەوی[١١] سامی، نوخانوەتەوە[١٢] بە

١ – **لانسار:** لاسێبەر: ئەو بەشە لە کێو یا هەر شتێکی زەق کە پشت لە هەتاو بێت... لوتکەی کێوەکە: مەقامی وەحی ـ**لانسارەکەی:** لە بڕی جێی ئەم بەیتە یانی: جامیعەی جاهیلی، لە بڕی جێش یانی: ئەم دنیا ـ بەرەو ڕۆژەکەشی: جامیعەی دینی، یان: میتافیزیکو عالەمی غەیب.

٢ – **خاڵۆ ڕێوگار:** خاڵۆ ڕێبوار: هەرکەس کە لە ڕێگاو تێکۆشان دایە بەرەو ئامانجێک، بەڵام چون حەزرەت ڕەسولالله (د.خ) هەمو ژیانی موبارەکی هەر هەوڵو تێکۆشان بوەو ئەویش بە شێوەیەکی دروستو هاوهەنگاو لەگەڵ واقیعو ڕاستیدا مەرحومی کاک ئەحمەد ئەو بە خاڵۆ ڕێبوارو هەروا بە ڕچەشکێنی ژیانی خۆی دەزانیو ڕوی قسەی لەوانە.

٣ – **دنیای دیارو نادیار:** فیزیکو متافیزیک، دنیاو ئاخرەت... یان دنیای دیار: ئەدەبی ظاهیری؛ وەک: ئەخلاقیات و...؛ نادیاریش یانی: مەعنەویو دەرونی؛ وەک: باوەڕو جەهانبینی و...

٤ – چون بەشەر مەوجودێکی نەناسراوە؛ بە تایبەت نیازگەڵو مەترسیگەڵو وەساویسی چاکو خراپی داهاتوی، بۆ خۆی ناتوانی ڕێگەی سەر ـ ڕاسی ژیان ببینێتەوە... (بڕوانەناملکەی فیترەتی کاک ئەحمەد).

٥ – بەرداویو دژوار.

٦ – ئەو سەر نادیار، بێنهایەت، نامەحدود.

٧ – **کلێڵە:** ڕندو، هەرەس: کلێڵەو... جڕ و جانەوەری...: تەرسیمێکە لە دنیای پڕ لە زوڵمو زاڵمی کۆمەڵگاکانی غەیرە دینیو هەروەها بە ناو دینی هاوچەرخ...

٨ – ئەم کێوە بەرزانە.

٩ – دینی هەقو هاوهەنگاو لە گەڵ ڕاستیدا: ئیسلام.

١٠ – ناحەقیو کافری.

١١– سەرتەنورێکی قورسو سەنگین بو کە قەدیم لە قوڕ دروستیان دەکردو لە سەر تەنوریان دادەنا بۆ ئەوە کپ بێ: نە گەرماکەی بێتە دەرێ؛ نە هیچی تێکەوێ... دەرخۆنە.

١٢ – سەرەوژێر کردن، بەسەردا دان.

سەر وڵاتا، ← چاو چاو ناوێنیٚ![1] ← بنۆسێک[2] چەس، بەرپا دیار نیە + هەنْاویٚ ئەگوٚزێتەوە، نازانی: پیٚ بە دەمی ئەژدەهاییٚکی حەفسەرا ئەکەی + یا ئەکەویتە گێری ئەڵقەییٚک لە هەزار داوی ← دیٚوی، بوٚ ڕاوی ئادەمێزادان، ← خوٚی داگرتوە لیٚم[3]!.

هەنْاو بە هەنْاو، ← جوٚرە بوٚگەنیٚ، بوٚچەکەۆڕیٚ،[4] ← بەرز ئەبیٚتەوە! + نازانم: بوٚنی هەناسەی دیٚوە![5] + یا هێن کەلاکی[6] دارِزێوی خەڵکی ڕیٚ گومکردۆس ← کە گورگو کەمتار[7]، هەڵیان درِێون ← یا بە هەناسەی نەحسی ژەحراویٚ یەکتر گەنێون ← وا دارِزێون + لە پێسیٚ دەرۆنی خوٚ خەملێون[8]! ++ دۆکەڵی ڕەش‌و کپ[9]، لە هەموٚ لا ← وەک جەردەی دڵڕەش ← سەر ڕیٚ گرتوە + هەر تاقە هەناسەییٚک بەی، پەلاماری، بوٚ بیٚنیٚ ← لیٚت ئەرِفیٚنیٚ! ++ لە تاو ئەم هەمگە بوٚو بەرامەی ← تیٚکەڵی ئەم دۆکەڵە ناوچاو تورشاوە، خوێنتاڵە، + کە ئەڵیٚی درگاییٚک لە جەحانم، بەرەو ئەم ناوە، کراوەتەوە، + بوٚ هەناسەییٚک[10]، وەختە بخنکیٚم.

---

١ – **چاو چاو نابینیٚ:** حوکمەتی تاریکی: گوناح‌و فەساد تا دەگاتە کوفرو ناهەقی.
٢ – بنْوسێک: بستێک.
٣ – **لە دنیای بیٚدینی‌دا ئەخلاق بیٚڕیشەیە...** یانی چون بیٚخوداو بیٚپاداشە دەوامی نابیٚ‌و هەمو شت‌و هەمو کەس مەشکوکە، سەداقەت بیٚمیسداقە.
٤ – **بوٚچروک، بوٚنی سوتاوی چەوری:** نەتایجی ئەوسافی غەیرە دینی، وەک بیٚئەخلاقی‌و دڵڕەقی‌و ستەم...
٥ – **هەناسەی دیٚو:** وەسوەسەی شەیتان‌و شەیتان سفەتان، یان:...
٦ – بە هیلاک چونی هەژاران‌و زوٚر لیٚکراوان، یان بیٚهاواڵان‌و بیٚهەوڵان...
٧ – **گورگ‌و کەمتار:** دەسەڵات‌داران‌و سەرمایەداران: موستەکبیرین‌و موتریفین.
٨ – **لە پیسی دەرونی خوٚ خەملیون:** پیسی هەمو دەرونیانی داگرتوە ـ خەملاندن، بە ڕەنگاندن‌و ڕازاوەبونیش ـ دەگوتریٚ: عەرزیٚ کەوا خەملیوە وەک بوکە بارانە ـ لیٚرەدا مەبەست ئەوەیە کە بە پیسی ڕەنگیان گرتوە...
٩ – زەڕو زوٚرو تەزویری ڕاوەستاو لە بەرانبەر هەق‌دا.
١٠ – **بوٚ هەناسەیەک...:** بوٚ قسەیەکی هەق، کاریٚکی باش... سوٚزو عاتیفەیەک.

